- ✓ ناوی کتێب: ڕستەسازی
- ✓ نووسینی: نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو
- ✓ تایپێست و نەخشەسازی: کۆچەر ئەنوەر نایف
- ✓ چاپ: یەکەم
- ✓ چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر
- ✓ تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ✓ نرخ : ٥٠٠٠ دینار
- ✓ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٠١)ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

# ناوەرۆك

# دەستپێک

ڕستەسازی ئاستێکی گرنگی زمانە، و لەگەڵ وشەسازی ئاستی ڕێزمان پێکدێنن، لێکۆڵینەوەش لەم ئاستەی زمان لە زمانی کوردیدا کەمە، یاخود هەمەلایەنانە نین، بەڵکو نووسینەکان هەریەکەیان لایەنێکی دیاریکراوی ڕستەیان گرتۆتەخۆ، کە ئەمەش وای لە ئێمە کرد ئەم بابەتە هەڵبژێرین و بەگوێرەی توانای خۆمان لەسەر ئەم بابەتە بنووسین.

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا موحازەرەکانی بابەتی ڕستەسازی بەشی کوردی کۆلیژی پەروەردەی قەڵادزێیە، کە لە چەند ساڵی ڕابوردوودا کارم بۆی کردبوو و لە موحازەراتەکاندا بەکارم هێناوە، لەگەڵ بەکارهێنانی هەندێ سەرچاوەی تایبەت بەم بوارە.

# ڕستەسازی

## چەمك و پێناسەی ڕستەسازی

ڕستەسازی زانستێکە لە ڕستە و فرێز و وشە دەکۆڵێتەوە. ڕستەسازی و وشەسازی بەشێکن لە ڕێزمان، بەو واتایەی بەیەکەوە ڕێزمان پێکدێنن. ئەم زاراوەیەش لە بنەڕەتدا لە زاراوەی (syntaxis ـ سینتاکس)ەوە هاتووە، کە زاراوەیەکی یۆنانییەوە و دواتر گوازراوەتەوە نێو زمانی ئینگلیزی. زاراوەی سینتاکسیش لە بنەڕەتدا بە واتای (دانان، ڕێکخستن) دێت، واتە سینتاکس لێکۆڵینەوەیە لە یەکگرتنی وشە لە نووسین و ئاخاوتندا.[1]

## چەمك و پێناسەی ڕستە

زمانناسان و نووسەران تا ئێستا چەندین پێناسەی جیاجیایان بۆ ڕستە کردووە، بۆیە لێرەدا هەندێك لەو پێناسانە دەخەینە ڕوو، دواتر لایەنی کەموکوڕی پێناسەکانیش شرۆڤە دەکەین:

* تۆفیق وەهبی دوو پێناسەی لەبارەی ڕستەوە خستۆتەڕوو:

(( جوملە بەیانکردنی حوکمێکە)).[2]

(( ڕستە زنجیرە وشەیەکە بیرۆکەیەکی تەواو دەردەخات)).[3]

---

[1] ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)(٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی، ل١٩٥.

[2] ـ تەوفیق وەهبی(١٩٢٩)، دەستووری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، چاپخانەی ( دار الطباعة الحديثة )، بەغدا، ل ١١.

[3] ـ ڕستەسازی لە زمانی کوردی دا، گ. کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد، بەرگی چواردەهەم، بەغدا، ١٩٨٦، ل١٦١.

* نووری عەلی ئەمین بەمشێوەیە پێناسەی ڕستەی کردووە:

(( بەو کۆمەڵە واژەیەی کە بەکاری ئەهێنین و مەعنایەکی تەواو ئەبەخشێ و فرمانێکی لەتەکدا ئەبێ پێی ئەلرێ ڕستە)).[1]

*محەممەد ئەمین هەورامانی لەبارەی ڕستەوە دەڵێت: (( ڕستە ئەو ئاخافتنەیە کە کاری تێدایە و واتای تەواو دەبەخشێ)).[2]

* د. نەسرین فەخری لەبارەی ڕستەوە دەڵێت: (( ڕستە کۆمەڵە وشەیەکی ڕێکخراوە بۆ مەبەستێك بەپێی یاسای زمان)).[3]

* د. وریا عومەر ئەمین لەبارەی ڕستەوە دەڵێت: (( ڕستە گەورەترین دانەی ڕێزمانی زمانە، ئامانجی هەرە سەرەکیی ڕێزمان پێناسینی ڕستەیە )).[4]

*د. کوردستان موکریانی لەبارەی ڕستەوە دەڵێت: (( ڕستە بچوکترین دانەی سینتاکسییە)).[5]

* چۆمسکی لەبارەی ڕستەوە دەڵێت:(( ڕستە بریتییە لە فرێزی ناوی و فرێزی کاری)) .

---

[1] ـ نوری عەلی ئەمین(١٩٦٠)، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ل ٣٦.

[2] ـ محەمەد ئەمین هەورامانی(١٩٨١)، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراوردا، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ل ٣٠٣.

[3] ـ نەسرین فەخری(د)(٢٠٠٢)، ڕستە و چمکی ڕستە بەگشتی و بەتایبەتمەندییەکانی لە زمانی کوردی دا، بەغدا، ل ١٢.

[4] ـ وریا عومەر ئەمین(٢٠٠٤)، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، دەزگای ئاراس، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ل ١٩٨.

[5] ـ ڕستەسازی لە زمانی کوردی دا، گ. کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد، بەرگی چواردەهەم، بەغدا، ١٩٨٦، ل١٦٢.

* د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف لەبارەی ڕستەوە دەڵێت:(( ڕستە بریتییە لە کردار و پێویستییەکانی )).[1]

* د. عەبدوڵڵا حوسێن لەبارەی ڕستەوە دەڵێت: (( ڕستە بریتییە لە ڕەگی کار و پێویستییەکانی)).[2]

* نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو لەبارەی ڕستەوە دەڵێت: (( ڕستە بریتییە لە وشەیەك یان زیاتر، کە واتایەك بدات بە دەستەوە)).

* ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە.

* ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە بەسەر یەکەوە مانای تەواو دەبەخشێ.

* ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە بەسەر یەکەوە واتای تەواو دەبەخشێ و لەکۆتایشدا نیشانەیەك دادەنرێت.

* ڕستە بریتییە لە وشەیەك یان زیاتر.

* ڕستە بریتییە لە بکەر و کار.

* ڕستە بریتییە لە بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و کار.

* ڕستە بریتییە لە نیهاد و گوزارە.

* ڕستە گەورەترین دانەی زمانە.

* ڕستە گەورەترین دانەی زمانە کە خاوەن ڕۆنانێکی ڕێکوپێکە.

ئەگەر سەیرێکی ئەم پێناسانەی پێشەوە بکەین، ئەوە دەبینین زۆربەیان لایەنی کەموکوڕی تێدایە، بۆیە لێرەدا شرۆڤەیان بۆ دەکەین :

---

[1] - ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)(٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی، ل١٧٥.

[2] - عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ(د)(٢٠٠٦)، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ل٤.

١- ئەو پێناسانەی، کە دەڵێن((ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە))،((ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە بەسەر یەکەوە مانای تەواو دەبەخشێ))،((ڕستە کۆمەڵە وشەیەکە بەسەر یەکەوە واتای تەواو دەبەخشێ و لەکۆتایشدا نیشانەیەك دادەنرێت)).ئەوە پێناسەیەکی گشتگیر نین، چونکە لەسەر هەموو ڕستەیەکی زمانی کوردی پیادە ناکرێن، بەهۆی ئەوەی دەشێ ڕستە لە تاکە وشەیەکیش پێك بێت، وەك:

**هات .**

**ڕۆیشت.**

**مرد.**

ئەم ڕستانە لە ڕۆنانی سەرەوەدا یەك وشەن، بەڵام لە ڕۆنانی ژێرەوەدا لە وشەیەك زیاتر پێکدێن، بە واتایەی لە فرێزی ناوی و فرێزی کاری پێکدێن.

٢- ئەو پێناسەیەی، کە دەڵێت: ((ڕستە بریتییە لە بکەر و کار))، پێناسەیەکی گشتگیر نییە، چونکە لەسەر هەموو ڕستەیەکی زمانی کوردی پیادە ناکرێت، بەڵکو تەنیا لەسەر یەك جۆری ڕستەی زمانی کوردی پیادە دەکرێت، ئەویش ئەگەر هاتوو کاری ڕستەکە کارێکی تێنەپەڕ بێت. وەکو:

**ـ ئازاد هات .**

**ـ ڕزگار ڕۆیشت.**

**ـ نەسرین مرد.**

٣- ئەو پێناسەیەی، کە دەڵێت: ((ڕستە بریتییە لە بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و کار)). ئەوە پێناسەیەکی گشتگیر نییە، چونکە لەسەر هەموو ڕستەیەکی زمانی کوردی پیادە ناکرێت، بەڵکو تەنیا لەسەر یەك جۆری ڕستەی زمانی

کوردی پیادە دەکرێت، ئەویش ئەگەر هاتوو کاری ڕستەکە، کارێکی بێت. وەك:

**- کارزان وانەکەی خوێند.**

**- شیلان نانەکەی خوارد.**

**- ئەحمەد دارەکەی شکاند.**

٤ــ ئەو پێناسەیەی، کە دەڵێت: (( ڕستە بریتییە لە نیهاد و گوزارە)). پێناسەیەکی گشتگیر نییە، چونکە لەسەر هەموو ڕستەیەکی زمانی کوردی ناکرێت، بەڵکو تەنیا لەسەر یەك جۆری ڕستەی زمانی کوردی پیادە دە ئەویش ئەگەر هاتوو کاری ڕستەکە، کارێکی ناتەواو بێت.وەکو:

**- شیرین جوانە .**

**- ئاواز زیرەکە .**

**- ژوورەکە پاکە .**

٥ــ ئەو پێناسەیەی، کە دەڵێت: ((ڕستە گەورەترین دانەی زمانە) پێناسەیەکی تەواو نییە، چونکە لە زماندا دانەی گەورەتر لە (ڕستە) بوونی وەك (ئاخاوتن، دیالۆگ، پەرەگراف، دەق، دارشتن)، بەلام دەکرێ پێناسەکە وشەی تری بۆ زیاد بکەیت، تاکو پێناسەیەکی گشتگیری لێدەردەچێت بەمشێوەیەی لێبێت:((ڕستە گەورەترین دانەی زمانە، کە خاوەن ڕۆن ڕێکوپێکە)). واتە وەکو دەردەکەوێت مەرج نییە هەموو دانەکانی (ئاخ دیالۆگ، پەرەگراف، دەق، دارشتن) خاوەن ڕۆنانێکی ڕێکوپێك بن.

کەواتە دەکرێ بڵێین ئەم پێناسانەی خوارەوە تارادەیەك زانستین، بە ب لەگەڵ پێناسەکانی تر:

* ڕستە گەورەترین دانەی زمانە، کە خاوەن ڕۆنانێکی ڕێکوپێکە.

* ڕستە بریتییە لە وشەیەك یان زیاتر، کە واتایەك بدات بە دەستەوە.

* ڕستە بریتییە لە فرێزی ناوی و فرێزی کاری .

## لقەکانی ڕستەسازی

ڕستەسازی لقێکە لە لقەکانی زمانناسی، کە چوار لق لەخۆوە دەگرێت، بەمشێوەیەی خوارەوە:[1]

### ١- ڕستەسازی مێژوویی

لقێکە لە لقەکانی ڕستەسازی، ئەم لقە باسی پەرەسەندنی ڕستە بە درێژایی مێژوو دەکات.

### ٢- ڕستەسازی بەراوردی

لقێکە لە لقەکانی ڕستەسازی، ئەم لقە بەراوردی ڕستەی زمانێك لەگەڵ ڕستەی زمانێکی تر دەکات، بە نموونە بەراوردکردنی ڕستەی زمانی کوردی لەگەڵ ڕستەی زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی یان فارسی.

### ٣- ڕستەسازی گشتی

لقێکە لە لقەکانی ڕستەسازی، کە بەشێوەکی گشتی باسی لایەنەکانی ڕستە دەکات، بەو واتایەی جەخت لەسەر ڕستەی زمانێکی دیاریکراو ناکات، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی باسی لایەنە جۆراوجۆرەکانی بواری ڕستە دەکات.

---

[1] - محمد علی الخولي(د)(٢٠٠)، مدخل الی علم اللغة، دار الفلاح للنشر و التوزيع، ص ٩٧.

### ٤ـ ڕستەسازی تایبەتی

لقێکە لە لقەکانی ڕستەسازی، ئەمجۆرەیان باسی لایەنەکانی ڕستە لە زمانێ دیاریکراو دەکات، بەو واتایەی ئەم لقەی ڕستەسازی پەیوەستە بە باسکرد ڕستەی زمانێکی دیاریکراو.

## تیۆرەکانی ڕستە[١]

بەدرێژایی ڕۆژگار زمانناسان بەگشتی و ڕستەسازەکان بەتایبەتی، گرنگییان تیۆرەکانی ڕستە داوە، کۆنترین تیۆریش، تیۆری لاساییکردنەوەیە، دوای تیۆرەش، تیۆری پێکهاتە ڕاستەوخۆکان دێت، پاشان تیۆری چاڵ، دواتر تیۆ گوێزانەوە .

### ١ـ تیۆری لاساییکردنەوە (کۆن ـ کلاسیك):ـ

ئەم تیۆرە گرنگی بە جۆرەکانی وشە دەدات، زمانەکانیش لە ژمار جۆرەکانی وشە جیاوازییان لە نێوانیاندا هەیە، بە نموونە زمانی عەرەبی وشە بە سێ بەش دابەشدەکات: (ناو، کار، پیت)، بەڵام زمانی ئینگلیزی وشە بۆ (هەشت) بەش دابەشی دەکات: (ناو، جێناو، ئاوەڵناو، کار، ئاوەڵکار، ئامر بەستنەوە، پریپۆزیشن و ئامرازی سەرسوڕمان و بانگکردن). زمانی کوردیش لە ڕوانگەوە جۆرەکانی وشە ( کە بە بەشەکانی ئاخاوتن ناودەبرێت) دابەشی دەکا بەگوێرەی قوتابخانەی زمانناسی ئینگلیزی بەسەر (٨) بەش دابەشی دەکات، بە گوێرەی قوتابخانەی زمانناسی ڕووسی بەسەر (١٠) بەش دابەشی دەکات، بەشەکانی ژمارە و پارتیکلی بۆ زیاد دەکات.

---

[١] - محمد علی الخولي(د)(٢٠٠)، مدخل الی علم اللغة، دار الفلاح للنشر و التوزیع، ص ١١٧.

هەروەها ئەم تیۆرە گرنگی بە شیکردنەوەی وشەکانی نێو ڕستە دەدات، واتە دیاریکردنی ئەرکی وشەکان لە نێو ڕستەدا: بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە... هتد.

**٢- تیۆری پێکهاتە ڕاستەوخۆکان:-**

ئەم تیۆرە پێی وایە ڕستە بەسەر دوو بەش دابەش دەکرێت، هەریەك لەمانەش بۆ دوو بەشی تر دابەش دەکرێت، هەر یەکە لەمانەش جارێکی تر بۆ دوو بەشی تر دابەش دەکرێت، ئیتر بەمشێوەیە تاکو دەگەین بە ئاستی وشە. بەو واتایەی لە بەرزترین دانەی ڕستەوە دەست پێدەکەین تا دەگەین بە بچووکترین دانەی نێو ڕستە، کە وشەیە، وەکو:

**- ئێمە دوێنێ بەیانی نانمان خوارد.**

**ئێمە**

**دوێنێ**

**بەیانی**

**نانمان**

**خوارد**

**٣- تیۆری چاڵ:**

ئەم تیۆرە پێی وایە، کە ڕستە بۆ بەدەستهێنانی چاڵ لە خانە پێکدێت، هەروەها ئەم تیۆرە وایدەبینێ، کە دەکرێ وشە بە گوێرەی وشەسازی پۆلێن بکەین، کە جیاوازە لەگەڵ پۆلێنکردنی ڕستەیی یان ئەرکی. پۆلێنکردنی وشەیی پشت بە ناواخنی زیادەکان دەبەستێت، کە وشە وەریدەگرێت، لە کاتێکدا کە پۆلێنکردنی

ڕستەیی (ئەرکی) پشت بە خانەکان دەبەستێت، کە وشەکان کاری تێدا دەکەن.

پۆلێنکردنەکانی ڕستە لە زمانی کوردیدا بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

١- چاڵی بکەر ← خانەی ناوی (ناو، جێناو)

**ئازاد هات .**

**ئەو ڕۆیشت .**

٢- چاڵی بەرکار (بەرکاری ڕاستەوخۆ) ← خانەی ناوی (ناو، جێناو)

**ئازاد نامە دەنووسێت.**

**ئازاد تۆ دەبات .**

٣- چاڵی بەرکار (بەرکاری ناڕاستەوخۆ) ← خانەی ناوی (ناو، جێناو)

**ڕزگار بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشت .**

**کارزان قسەکە بە تۆ دەڵێت .**

٤- چاڵی نیهاد ← خانەی (ناو، جێناو)

**ئازاد زیرەکە .**

**ئەو جوانە .**

٥- چاڵی گوزارە ← خانەی (وشە + کاری ناتەواو)

**نەسرین جوانە.**

٦- چاڵی کاری ← خانەی (تێپەڕ، تێنەپەڕ)

**سیروان نان دەخوات .**

**کارزان هات .**

**٤ـ تیۆری گوێزانەوە:ـ**

ئەم تیۆرە وا دەڕوانێتە ڕستە، کە لە دوو ڕۆنان پێکدێت، ڕۆنانی سەرەوە (ئاستی ڕووکەش) و ڕۆنانی ژێرەوە (ئاستی قووڵ)، هەروەها یاساکانی گوێزانەوەش بریتین لە (یاسای زۆرەملێ، یاسای هەڵبژاردن)، ئەم یاسایانەش هەڵدەستن بە گوێزانەوەی ڕستە لە ئاستی ژێرەوە بۆ ئاستی سەرەوە، وەکو:

**١ـ زانایانی کورد زانستیان پێشخست.**

**٢ـ زانست زانایانی کورد پێشیان خست.**

**٣ـ زانایانی کورد پێشیاخست زانست.**

**٤ـ زانایانی کورد ئەوان بوون زانستیان پێشخست.**

**٥ـ ئەوانەی کە زانستیان پێشخست بریتی بوون لە زانایانی کورد.**

**٦ـ کێ زانستی پێشخست؟**

**٧ـ زانست لە ڕێگەی زانایانی کوردەوە پێشکەوت.**

**٨ـ زانایانی کورد پێشکەوتنی زانستیان پێشخست.**

ئەگەر سەیری ئەم ڕستانەی سەرەوە بکەین، ئەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە هەموو ڕستەکان لە یەك ڕستەی سەرەکی وەرگیراون، ئەویش ڕستەی یەکەمە یاخود سێیەم.

بۆیە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی یاساکانی گوێزانەوە ڕستەیەکی سەرەکی بگۆڕێت بۆ چەندین ڕستەی وەرگێراو. هەروەها گوێزانەوەی ڕستەکانیش دەکرێ لەم ڕوانگانەوە بێت:ـ

١ـ گوێزانەوەی لە ڕستەی ئەرێ بۆ ڕستەی نەرێ.

٢ـ گوێزانەوەی لە ڕستەی هەواڵگەیاندن بۆ ڕستەی پرسیارکردن.

٣ـ گوێزانەوەی لە ڕستەی ناوی بۆ ڕستەی کاری.

٤- گوێزانەوەی لە ڕستەی بکەر دیار بۆ ڕستەی بکەر نادیار.

٥- گوێزانەوەی لە ئاخاوتنی ناڕاستەوخۆ بۆ ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ.

٦- گوێزانەوەی لە ڕستەیەکی جەختنەکراو بۆ ڕستەیەکی جەختکراو.

## ئەرکەکانی ڕستەسازی

ڕستەسازی چەندین ئەرکی جیاجیا دەبینێت، کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیا دەکەین:

١- ڕستەسازی ڕستەی ڕێزمانی و ڕستەی ناڕێزمانی لەیەکتر جیادەکاتەوە.

**- هەموو منداڵەکان دوێنێ نانیان خوارد. ڕێزمانییە.**

**- منداڵەکان دوێنێ نانیان خوارد هەموو. ناڕێزمانییە.**

لەم دوو ڕستەیەی سەرەوەدا، وشەی( هەموو) دیارخەرە، وشە: (منداڵەکان) دیارخراوە، بۆیە پێویستە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دیارخەر و دیارخر لەیەکترییەوە نزیك بن، لەهەمان کاتیشدا تا لە یەکتریشەوە دوور بن، لە ڕستە: ڕێزمانی دووردەکەونەوە، هەر بۆیە لە ڕستەی دووەمدا دیارخەر و دیارخراو تەو لەیەکترییەوە دوورکەوتوونەتەوە، بۆیە بۆتە ڕستەیەکی ناڕێزمانی.

هەروەها لێرەدا دەبێ ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە مەرج نییە ڕستەیەك ناڕێزمان بێت، لەهەمان کاتدا واتادار نەبێت. بۆ نموونە ڕستەی (هەموو منداڵەکان دوێنێ نانیان خوارد)، ڕستەیەکی ڕێزمانییە و واتادارە، کەچی ڕستەی (منداڵەکان دوێنێ نانیان خوارد هەموو) ڕستەیەکی ناڕێزمانییە، بەڵام واتادارە، چونکە گوێگر لە واتا: ڕستەکە دەگات.

یاخود هەروەکو ئەم دوو ڕستەیە:

**- کارزان نانی خوارد. ڕێزمانییە، واتادارە**

**- کارزان بەردی خوارد. ڕێزمانییە، بێ واتایە**

٢- لە نێوان ڕستەی ڕێزمانی و ڕستەی ناڕێزمانیدا پلە هەیە، هەر بۆیە ڕستەسازی پلەکان دەست نیشان دەکات. وەك:

**- هەموو منداڵەکان دوێنێ نانیان خوارد. ڕێزمانییە.**

**- منداڵەکان هەموو دوێنێ نانیان خوارد. نزیکە لە ڕێزمانی.**

**- منداڵەکان دوێنێ هەموو نانیان خوارد. نزیکە لە ڕێزمانی.**

**- منداڵەکان دوێنێ نانیان هەموو خوارد. نزیکە لە ڕێزمانی.**

**- منداڵەکان دوێنێ نانیان خوارد هەموو. ناڕێزمانی.**

لەم ڕستانەی سەرەوەدا، وشەی (هەموو) دیارخەرە، وشەی منداڵەکان (دیارخراو)ە، بۆیە دەبێ ئەم دوو وشەیە لەیەکتریەوە نزیك بکرێنەوە، بەجۆرێك تا چەند دیارخەرەکە لە دیارخراوەکە دوور بکەوێتەوە، ئەوە ئەوەندە لە ڕێزمانی دوور دەکەویتەوە و لە چەمکی (نزیکە لە ڕێزمانی) نزیك دەبێتەوە. وشەی (هەموو) لە هەر وشەیەك نزیك بێتەوە، ئەوە زیاتر جەخت دەکاتە سەر وشەکە، بەو واتایەی لە ڕستەی یەکەمدا دیارخەرەکە جەختی کردۆتە سەر وشەی ( منداڵەکان)، لە ڕستەی دووەمدا دیارخەرەکە جەختی کردۆتە سەر وشەی (دوێنێ)، لە ڕستەی سێیەمدا دیارخەرەکە جەختی کردۆتە سەر وشەی (نان)، لە ڕستەی چوارەمدا دیارخەرەکە جەختی کردۆتە سەر وشەی (خوارد).

٣- ڕستەسازی تەمومژی (لێڵی) ڕستە دەست نیشان و چارەسەریان دەکات، ( مەبەست لە لێڵیش بەو وشە و فرێز و ڕستانە دەوترێت، کە زیاتر لە واتایەکیان هەیە، بۆیە ڕستەسازی هەوڵدەدات چارەسەری لێڵی ئەو ڕستانە بکات و سەرچاوەی لێڵییەکانیش دەست نیشان بکات، وەك:

**- پێم دەشکێ.**

ئەم ڕستەیە دوو واتای هەیە:

١- واتای یەکەم: بە من دەشکێ.

لێرەدا سەرچاوەی لێڵییەکە پەیوەندی بە ڕێزمانەوە هەیە، چونکە پێشبەندی( بە)، هەندێجار لە حاڵەتی سینتاکسدا شێوەی خۆی دەگۆڕێت و دەبێت بە (پێ).

٢- واتای دووەم: قاچم دەشکێ.

لێرەدا سەرچاوەی لێڵییەکە پەیوەندی بە وشەوە هەیە، چونکە لە فەرهەنگدا وشەی (پێ) بە واتای (قاچ)یش دێت.

پێ ⟵ بە      م ⟵ من      پێ ⟵ قاچ

**- پێم دەخوریّ .**

ئەم ڕستەیە دوو واتای هەیە:

١- واتای یەکەم: بە من دەخوریّ.

لێرەدا سەرچاوەی لێڵییەکە پەیوەندی بە ڕێزمانەوە هەیە، چونکە پێشبەندی( بە)، هەندێجار لە حاڵەتی سینتاکسدا شێوەی خۆی دەگۆڕێت و دەبێت بە(پێ).

٢- واتای دووەم: قاچم دەخوریّ.

لێرەدا سەرچاوەی لێڵییەکە پەیوەندی بە وشەوە هەیە، چونکە لە فەرهەنگدا وشەی (پێ) بە واتای (قاچ)یش دێت.

پێ ⟵ بە      پێ ⟵ قاچ      م ⟵ من

هەروەها لێرەدا ئەوەش دەخەینە ڕوو، کە لە ڕستەی یەکەمدا ( دەخوریّ)، لە چاوگی (خواردن) هاتووە، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا( دەخوریّ) لە چاوگی (خوران)ەوە هاتووە.

لـەم ڕسـتانەدا تەمومژییـەکان ڕێزمـانی و وشـەیین، هـەر بۆیـە ڕستەسـازی توانیویەتی چارەسەریان بکات، بـەڵام ڕستەسـازی ناتوانێـت چارەسـەری تەمومـژی فەرهەنگی بکات، وەك:

شـیر ⟵ شمشێر یان شیری خواردن

شـیرەکە بێنە. ⟵ شمشێرەکە بێنە. یـان شیرەکە ( شیری خواردن ) بێنە.

ڕستەسازی ناتوانێت چارەسەری تەمومـژی فەرهـەنگیی وشـەی (شـیر) بکـات، چونکە لە فەرهەنگدا وشەی (شیر) بۆ دوو واتای جیاوازی( شمشێر، شیری خـواردن) بەکاردێت.

ئەگەرچـی لەهەنـدێ ڕسـتەی تـردا واتـای وشـەی (شـیر ) ڕوون بۆتـەوە، بەواتایەکی تر تەمومژی وشەی (شیر) چارەسەرکراوە، بە هۆیەوە گوێگر یان خوێنەر لە واتای ئەم ڕستانەی خوارەوە دەگات:

**شـیرەکـە خـۆشـە. ⟵ شـیری خـواردن**

**شـیرەکـە کولا. ⟵ شـیری خـواردن**

**شیرەکە شکا. ⟵ شمشێر**

٤ـ ڕستەسازی کەرەسە سەرەکی و لاوەکییـەکانی ڕسـتە دەخاتـە ڕوو، مەبەسـت لـە کەرەسە سەرەکییەکان: ئەو کەرەستانەن کـە دەبێـت لـە ڕسـتەدا بوونیـان هـەبێت، بەجۆرێك ئەگەر هاتوو لە ڕۆنانی سەرەوەدا دەرنەکەون، ئـەوە لـە ڕۆنـانی ژێـرەوەدا دەردەکەون.

کەرەسە سەرەکیەکان لە زمانی کوردیـدا لەم سێ حاڵەتەی خوارەوەدا دەبینرێن:

أ / لە حاڵەتی کاری تێپەڕدا ⟵ بکەر + بەرکاری ڕاستەوخۆ + کـاری تێپەڕ

**ـ ئەحمەد وانەکەی خوێند .**

ب/ لە حاڵەتی کاری تێنەپەڕدا ⟵ بکەر + کـاری تێنەپەڕ

**- شیلان ڕۆیشت .**

جـ/ لە حاڵەتی کاری ناتەواودا ⟵ نیهاد + گـوزارە ( وشە + کاری ناتەواو)

**- نەسرین جوانە .**

مەبەسـت لـە کەرەسـە لاوەکییـەکان: ئـەو کەرەسـتانەن بـۆ مەبەسـتی فراوانکردنی ڕستە بەکاردێن، بەجۆرێك لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەشێ ئەم کەرەسانە لە ڕستەدا لابەرین، بەبێ ئـەوەی واتـای سـەرەکی ڕسـتە تێك بـدات، هـەروەکو لـەم نموونانەی خوارەوەدا کەرەسە لاوەکی و سەرەکییەکان ڕوون دەکرێنەوە:

**- هـــات.**

**- ئەو هـــات.**

**- ئەو بە ئوتۆمبێل هـــات.**

**- ئەو دوێنێ ئێوارە بە ئوتۆمبێل هـــات.**

**- ئەو دوێنێ ئێوارە لەگەڵ براکانی بە ئوتومبێل هـات.**

**- ئەو دوێنێ ئێوارە کاتژمێر حەوت لەگەڵ براکانی بە ئوتومبێل هات.**

ئەگـەر سـەیرێکی ئـەم ڕسـتانەی سـەرەوە بکـەین، دەبینـین کـاری ڕسـتەکە کارێکی تێنەپەڕە، کەواتە تەنیا پێویستی بە بکەر و کار هەیە، بە واتایەکی تـر جگـە لەم دوو کەرەسەیە هەموو کەرەسەکانی نێو ڕستەکە بە لاوەکی دادەنرێن، چونکە بۆ مەبەستی فراوانکردن بەکارهاتوون.

٥- جیاکردنەوەی کەرەسەکانی ڕستەسازی لە کەرەسەکانی وشەسازی. بەو واتایـەی ڕستەسازی خاوەنی کەرەسەی تایبەت بـە خۆیـەتی، کەواتـە ڕستەسـازی لـە ئـەرکی وشـەکانی نێـو ڕسـتە دەکۆڵێتـەوە، نـەوەك لـە فەرهـەنگی وشـەکان، کەرەسەکـانی ڕستەسازی بریتین لـــە:

- بکەر و جۆرەکانی:( بکەری ڕێزمـانی، بکـەری لـۆجیکی، بکـەر دیـار، بکـەر نادیـار، بکەر نادیاری ئاماژەپێکراو)
- بەرکار و جۆرەکانی:(بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ).
- نیــهاد و گــوزارە.
- تەواوکـەر :(تەواوکـەری کـاری ڕابـردوو، تەواوکـەری کـاری ڕانـەبردوو، تەواوکـەری فەرمانـدان، تەواوکـەری کـاری ناتـەواو، تـــەواوکـــەری نـــاو، تەواوکـەری جێنـاو، تەواوکەری ئاوەڵناو.....).
- دیارخەر.
- دیارخراو.

**کەرەسەکــانی وشەسازی**

- نـاو و جۆرەکـانی (ژمارە، ناسین، هەبوون، ناوەرۆك، پێکهاتن، ڕەگەز).
- کـار و جۆرەکـانی (کـات، هێز، پێکهـاتن، تـەواوی، ڕێژە، ئـەرێنی).
- ئاوەڵناو و جۆرەکانی ( واتا، پێکهاتن، پلە).
- جێناو و جۆرەکانی ( واتا، پێکهاتن،.....)

...........هتد.

**کەرەسەکانی ڕستەسازی**

**- ئەحمەد زیرەکە.**

ئەحمەد: نیهاد

زیرەکە: گوزارە

**- کاروان هـات.**

کاروان: بـکەر

هات: کاری تێپەڕ

**- نــازدار وانــەکەی خــوێند.**

نازدار: بکەر

وانەکە:بەرکـاری ڕاستەوخۆ

خوێند: کاری تێپەڕ

**کەرەسەکانی وشـــەسـازی:**

ئەحمەد: ناوە، ناسراوە، تایبەتییە، نێرە،...

زیرەکـ:ئاوەڵناوە،چەسپاوە، چۆنیەتییە،سادەیە....

کـاروان: ناوە،ناسراوە، تــایبەتییە،.....

هــات: کــارە، ڕابوردووە، تەواوە، ئەرێیە.....

نــازدار: ناوە، مێیە، ناسراوە، تایبەتییە....

وانــەکە: ناوە، گشتییــە، ناسراوە، بێلایەنە...

خــوێند: کارە، ڕابوردووە، ئەرێیە، تـــەواوە......

٦- ڕستەسازی دەتوانێت ڕستە لە ڕووی پێکهاتنەوە دیاری بکات:

١- ڕستەی ســـــادە: ( أ/ سادەترین ڕستە، ب/ ڕستەی سادەی ئاسایی، جـ/ ڕستەی سادەی فراوانکراو).

**٢- ڕستەی لــێکدراو:( أ/ ڕستەی لێکدراوی هاوڕێك، ب/ ڕستەی لێکدراوی نەرێنــی، جـ/ ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردن، د/ ڕستەی لێکدراوی پێچەوانەیی).**

٣- ڕستەی ئــاڵــۆز: ( أ/ شــاڕستە، ب/ پــاڕستە).

٧- ڕستەسازی دەتوانێت ڕستە لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دیاری بکات:

( ڕستەی هەواڵگەیاندن، ڕستەی پرسیـــــاری، ڕستەی فـــەرمـاندان، ڕستەی سەرسوڕمـــان) .

٨- ڕستەسازی دوو دیوی ڕستە دیاری دەکات، ڕۆنانی سەرەوە و ڕۆنانی ژێرەوە. مەبەست لە ڕۆنانی سەرەوە دیوی دەرەوەی ڕستە و دیوی ڕووخسار دەگرێتەوە. مەبەست لە ڕۆنانی ژێرەوە بنجی ڕستە و دیوی ناوەوە و ناوەرۆکی ڕستە دەگرێتەوە.

## جـــــۆرەکانی ڕستە

یەکەم: جۆرەکانی ڕستە لەڕووی نـاوەڕۆکـــەوە:

* ڕستەی هەواڵگەیاندن
* ڕستەی پرسیــــاری
* ڕستەی فـــەرمـاندان
* ڕستەی سەرسوڕمـــان

دووەم: ڕستە لەڕووی پـێکهـاتنـەوە:

١ـ ڕستەی ســـــادە: أ/ سادەترین ڕستە
ب/ ڕستەی سادەی ئاسایی
جـ/ ڕستەی سادەی فراوانکراو

٢ـ ڕستەی لـێکـدراو: أ/ ڕستەی لێکدراوی هاوڕێك
ب/ ڕستەی لێکدراوی نەرێنـــی
جـ/ ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردە
د/ ڕستەی لێکدراوی پێچەوانەیی

٣ـ ڕستەی ئـاڵـۆز: أ/ شـاڕستە
ب/ پـاڕستە

## ڕستە لەڕووی ناومرۆکەوە: [1]

### أ- ڕستەی هەواڵگەیاندن:

بەو ڕستانە دەگوترێت کە قسەکەر زانیاری یان هەواڵ دەگەیەنێت **و باسی** دەوروبەری خۆی دەکات، واتە لە ڕستەی هەواڵگەیاندندا قسەکەر **سەرچاوەی زانین** و زانیارییە.

**تایبەتمەندییەکانی ڕستەی هەواڵگەیاندن:** [2]

١- ڕستەی هەواڵگەیاندن دەشێ دروست بێت و دەشێ نادروست بێت، **واتە دەشێ** هەواڵەکە ڕاست بێت یا دەشێ هەڵە بێت، وەك:

**هەنگوین تاڵە .		دروست نییە**

**شەکر تاڵە .		دروست نییە**

**کارزان زیرەکە .		دروستە**

**مەلا مستەفای بارزانی سەرکردەیەکی کوردە.		دروستە**

٢- لەهەندێ حاڵەتدا دەتوانرێت کەرەسەکانی نێو ڕستەی هەواڵگەیاندن **جێگۆڕکێ** بکرێن، بەبێ ئەوەی واتای سەرەکی ڕستەکە تێکبدات، وەك:

**کارزان دەچێت بۆ زانکۆ.**

**کارزان بۆ زانکۆ دەچێت.**

٣- بەڵام لە هەندێ حاڵەتی تردا، بەهۆی جێگۆڕکێی شوێنی کەرەسەکانی **نێو ڕستە،** ئەوە واتای ڕستەکە تێکدەچێت یان پێچەوانە دەبێتەوە، وەك:

**ئازاد لە نەوزادی دا.**

---

[1] - بۆ ئەم تەوەرەیە پشت بەم سەرچاوەیە بەستراوە: قەیس کاکل تۆفیق(١٩٩٥)، **جۆرەکانی ڕستە و** تیۆری کردە قسەییەکان،نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین.

[2] - قەیس کاکل تۆفیق(١٩٩٥)، ل ١٨-١٩ .

**نەوزاد لە ئازادی دا.**

٤ـ ڕستەی هەواڵگەیاندن دەشێ لە وشەیەك پێك بێت و دەشێ زیاتر لە وشەیەك پێك بێت، وەك:

**هات.**

**ئەو هات.**

**ئەو دوێنێ بەیانی هات.**

واتە بچوکترین ڕستەی هەواڵگەیاندن تاکە وشەیەکە، بەلاّم گەورەترین و درێژترین ڕستەی هەواڵگەیاندن لە زماندا ناتوانرێت دەستنیشان بکرێت، بەهۆی فراوانکردنی ڕستە بە کەرەسەی لاوەکییەوە.

٥ـ بەزۆری ڕستەی هەواڵگەیاندن بە بکەر یان نیهاد دەست پێدەکات و بە کار کۆتایی دێت، وەك:

**ـ شیلان جوانە.**

**ـ کاروان نانەکەی خوارد.**

**ـ سۆران مردووە.**

٦ـ ڕستەی هەواڵگەیاندن شێوازی ئەرێ و نەرێی هەیە.

**ـ شیلان جوانە.**

**شیلان جوان نییە.**

**ـ کاوە دەبێت بە ئەندازیار.**

**کاوە نابێت بە ئەندازیار.**

**ـ کاوە ئەندازیار بوو.**

**کاوە ئەندازیار نەبوو.**

**ـ کاروان نانەکەی خوارد.**

**کاروان نانەکەی نەخوارد.**

**- ســۆران دەمـرێت.**

**سۆران نامــرێت.**

٧- لە کۆتایی ڕستەی هەواڵگەیاندندا نیشانەی خـاڵ ( . ) دادەنرێت.

**نەسرین هات.**

٨- قسەکەر سەرچاوەی زانین و زانیارییە .

## ب - ڕستەی پرسیاری:

بەو ڕستانە دەگوترێت کە قسەکەر بۆشاییەکی لـە زانیارییـەکانی هەیـە، بـەو واتایــەی قســەکەر شــتێك نازانێــت یــاخود لــە لای ڕوون نییــە، بۆیــە بــەهۆی پرسیارکردنەوە زانیارییەکانی دەسـت دەکـەوێت، کەواتـە لـە ڕسـتەی پرسـیارکردندا گوێگر سەرچاوەی زانین و زانیارییە . هـەروەها لـە ڕسـتەی پرسـیارکردندا نیشـانەی پرسیاری (؟) لەکۆتایی ڕستەکە دادەنرێت.

**تایبەتمەندییەکانی ڕستەی پرسیاری:**

١- نیشانەی پرسیارکردن (؟) لە کۆتایی ڕستە دادەنرێت.

٢- گوێگر سەرچاوەی زانین و زانیارییە .

٣- لە زمانی کوردیدا بە دوو شێواز ڕستەی پرسیارکردن دروست دەکرێت:

١. بــەهۆی جێناوەکـانی پــرس : (کـێ، کـام، بـۆ، چـۆن ...هــتد)، واتــە لێــرەدا جێناوەکانی پرسیار و نیشانەی پرسیاری لە ڕستەدا دەردەکەون .

**چۆن یارییەکەتان بــردەوە؟**

**کێ شاری سلێمانی دروستکرد؟**

٢. بەهۆی ئاوازەوە ڕستەی پرسیاری دروست دەبێت، واتە لەم جۆرەدا جێناوەکانی پرسیاری بەشداری لە دروستکردنی ڕستەی پرسیاری ناکەن، بەڵکو تەنیا نیشانەی پرسیار لە ڕستەدا دەبینرێت. ئاوازەش زیادە پاڵەپەستۆیەکە دەکەوێتە سەر وشەیەك لە وشەکانی نێو ڕستە، ئەم پاڵەپەستۆیەش بکەوێتە سەر هەر وشەیەك لە وشەکانی ڕستەکە، ئەوە پرسیارەکە تایبەت دەبێت بەو وشەیە. بۆنموونە:

***قۆناغی دووەم دوێنێ هەموویان ئامادەبوون.*** ***ڕستەی هەواڵگەیاندن.***

**ـ قۆناغی دووەم دوێنێ هەموویان ئامادەبوون؟ پرسیارکردنەکە لەبارەی (قۆناغی دووەم) دەکرێت.**

**ـ قۆناغی دووەم دوێنێ هەموویان ئامادەبوون؟ پرسیارکردنەکە لەبارەی (دوێنێ) دەکرێت.**

**ـ قۆناغی دووەم دوێنێ هەموویان ئامادەبوون؟ پرسیارکردنەکە لەبارەی (هەموویان) دەکرێت.**

**ـ قۆناغی دووەم دوێنێ هەموویان ئامادەبوون ؟ پرسیارکردنەکە لەبارەی (ئامادەبوون) دەکرێت.**

ئەگەر سەیرێکی ئەم ڕستانەی سەرەوە بکەین، دەبینین پرسیارکردنەکە هەر جارەی لە وشەیەکەوە دەکرێت، هەر بۆیەش وەڵامدانەوەکەش دەبێت پەیوەست بێت بەهەمان وشەوە، هەروەکو لەخوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

**وەڵامی پرسیاری ڕستەی یەکەم - بەڵێ قۆناغی دووەم. نەخێر قۆناغی یەکەم.**

**وەڵامی پرسیاری ڕستەی دووەم - بەڵێ دوێنێ. نەخێر پێرێ.**

**وەڵامی پرسیاری ڕستەی سێیەم - بەڵێ هەموویان. نەخێر هەندێکیان.**

**وەڵامی پرسیاری ڕستەی چوارەم - بەڵێ ئامادەبوون. نەخێر ئامادەنەبوون.**

## جـ/ ڕستەی فەرماندان:

بەو ڕستانە دەوترێت کە کەسی یەکەم، واتە قسەکەر داوا لە کەسی دووەم، واتە گوێگر دەکات، کارێك ئەنجامبدات یان ئەنجامنەدات.

**تایبەتمەندییەکانی ڕستەی فەرماندان لە زمانی کوردیدا:**

١- دەشێ ڕستەی فەرماندان تەنیا لە کاری فەرماندان پێك بێت، وەك:

**بڕۆ.**

**دانیشە.**

**بخوێنە.**

٢- دروستکردنی ڕستەی فەرماندان لە زمانی کوردیدا پەیوەستە بە کاری فەرماندان، وەك:

**ئازاد نامە دەنووسێت.**

**ئازاد نامە بنووسە.**

٣- لە ڕستەی فەرماندانـدا گوێگر بەدوای دروستی و نادروستی ڕستەکە ناگەڕێت، بەڵکو لەسەریەتی تەنیا کارەکە جێبەجێ بکات.

٤- لە ڕستەی فەرماندانـدا نیشانەی(.) لە کۆتایی ڕستە دادەنرێت.

**یاساکانی درەستکردنی ڕستەی فەرماندان لە زمانی کوردیدا**

لە زمانی کوردیدا دروستکردنی ڕستەی فەرماندان پەیوەستە بە کاری فەرماندانەوە. دەستووری سەرەکی کاری فەرماندانیش لە زمانی کوردیدا بریتییە لە:

**١- بۆ حاڵەتی ئەرێ:**

**بـ + ڕەگی کار + جێناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی چوارەم( ە، ن )**

**خوێندن ⟵ خوێن ⟵ بخوێنە ⟵ بخوێنن**

ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی نەبزوێن هاتبێت، ئەوە جێناوە لکاوەکانی (ە،ن) بە ڕەوانی بە ڕەگەکەوە دەلکێت، بەهۆیەوە کاری فەرماندان دروستدەکرێت، بەلاَم ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی بزوێن هاتبێت، ئەوە جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك ( ە ) دەرناکەوێت، کەچی جێناوی لکاوی کەسی دووەمی کۆ ( ن ) دەردەکەوێت، وەك:

| چاوگ | ڕەگی کار | کاری فەرماندان |
|---|---|---|
| کردن | کە | بکە، بکەن |
| بردن | بە | ببە، ببەن |
| شووشتن | شۆ | بشۆ، بشۆن |
| خواردن | خۆ | بخۆ، بخۆن |
| نووستن | نوو | بنوو، بنوون |
| وتن (گوتن) | ڵێ | بڵێ، بڵێن |

هەردوو چاوگی (هاتن، چوون) لەسەر دەستوور ناڕۆن:

| چاوگ | ڕەگی کار | کاری فەرماندان |
|---|---|---|
| هاتن | هێ (ێ) | وەرە، وەرن |
| چوون | چ | بچۆ، بچن |

تێبینی/ لە شارۆچکەی کەلار و شوێنەکانی تری ناوچەی گەرمیان، چاوگی( هاتن ) بۆ کردنی بە کاری فەرماندان لەسەر دەستوور دەڕوات، واتە بەمشێوەیەی لێدێت:

**هاتن ⟵ هێ(ێ) ⟵ بێ، بێن**

**٢ـ بۆ حاڵەتی نەرێ:**

**مە + ڕەگی کار + جێناوە لکاوەکانی کۆمەڵـەی چوارەم( ە، ن )**

**بـخوێنە ⟵ مـەخوێنە**

چاوگی (هــاتن) وەکـو لـە پێشـەوە ئاماژەمـان بـۆی کـرد لـە حاڵـەتی ئـەرێی فەرمانـدان لــە دەســتوور لادەدات، بــەڵام لــە حاڵــەتی نەرێــدا دەگەڕێتــەوە ســـەر دەســتوور، بەمشێوەیە:

| کاری فەرماندان | ڕەگی کار | چـــاوگ |
| --- | --- | --- |
| مەیێ، ( مێ )، مەیێن، مێن | هێ (ێ) | هـــاتن |

لـــە حاڵـــەتی داڕژاو و لێکـــدراودا نیشـــانەی ( بـــ )ی فەرمانـــدان دەشـــێ دەرنەکەوێت.وەك:

| کاری فەرمـــاندان | ڕەگی کار | چـــاوگ |
| --- | --- | --- |
| سەرکەوە، سەرکەون | ســەرکەو | سەرکەوتن |
| دانیشـە، دانیشـــن | دانــیش | دانیشـــتن |
| دابەزە، دابەزن | دابەز | دابەزین |
| هەڵگرە، هەڵگرن | هەڵگر | هەڵگرتن |
| داخە، داخەن | داخە | داخستن |

بەڵام نیشانەی نـەرێی فەرماندان(مـە)، لـە سـادە و داڕژاو و لێکـدراودا هـەر دەبێـت دەرکەوێت، وەك:

**بڕۆ ⟵ مەڕۆ**

**دانیشە ⟵ دامەنیشە**

**سەرکەوە ⟵ سەرمەکەوە**

وەكو لە پێشەوە ئامارەمان بۆی كرد كە كاری فەرماندان بەهۆی ڕەگی كارەوە دروستدەكرێت، كەچی لە هەندێ حاڵەتدا ڕەگی كار زیاتر لە شێوەیەكی هەیە، بەنموونە چاوگی ( هاویشتن ) یەكێكە لەو چاوگانەی كە لە زمانی كوردیدا زیاتر لە ڕەگێكی هەیە، وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| هاویشتن[1] | هاوێژ ← | بهاوێژە ← | بهاوێژن |
| | هاوێ ← | بهاوێ ← | بهاوێن |
| | اوێ ← | باوێ ← | باوێن |

لە زمانی كوردیدا هەندێ دەستەواژە و ڕستەمان هەیە، كە بەبێ ئەوەی مۆرفێمی فەرماندان لە ڕستەدا بوونی هەبێ، كەچی ڕستەكە بۆ مەبەستی فەرماندان بەكاردێت. وەك:

**- وەستان قەدەغەیە.**

**- جگەرەكێشان قەدەغەیە.**

لەم دوو ڕستەیە وشەی ( قەدەغە) ڕۆڵی سەرەكی بینیوە لە دروستكردنی ڕستەی فەرماندان.

## د/ ڕستەی سەرسوڕمان:

بەو ڕستانە دەوترێت كە قسەكەر هەستی خۆی بەرانبەر دەوروبەری دەردەبڕێ، ئەم هەست دەربڕینەش یان بۆ حاڵەتی خۆشییە یان بۆ حاڵەتی ناخۆشی.

---

[1] ـ قەیس كاكل توفیق(١٩٩٥)، ل ٣١.

**تایبەتمەندییەکانی ڕستەی سەرسوڕمان لە زمانی کوردیدا:**

١ـ لە ڕستەی سەرسوڕمانیدا نیشانەی سەرسوڕمانی ( ! ) لە ڕستەدا دەبینرێت.

٢ـ لەڕستەی سەرسوڕمانیدا وشەی سەرسوڕمانی بەشداری تێدا دەکـــــات.

٣ـــ دەشــێ وشــەی سەرســوڕمانی لــە ڕســتەکەدا نــەبینرێ، بــەڵام نیشــانەی سەرسوڕمانییەکە هەر دەمێنێ.

وەکو لـە پێشـەوە ئاماژەمـان بـۆی کـرد، کـە ڕسـتەی سەرسـوڕمانی بـۆ دوو شـێواز بەکاردێت:

شێوازی یەکەم : بۆ حاڵەتی خۆشییە، کە لەم جۆرەدا قسەکەر هەستی خۆشی خۆی بەرانبەر دیاردەیەکی دەوروبەری دەردەبڕێت، بۆیە لەمجۆرەدا وشـەکانی ( هەربـژی، ئافـەرین، ئۆخـەی،...... ) بـەکاردێت، واتــە لـەمجۆرەدا قسـەکەر هەسـتی خـۆی بەڕاستی و بەبێ دەسکاری وەك چـۆن لـە دەروونیـدا هەیـە دەریـدەبڕێت، بـەجۆرێك ئەمجۆرەیان بۆ مەبەستی هاندان و دەستخۆشی کردنی بەکاردێت. وەك:

**ئۆخەی! لەم بابەتە ڕزگارمان بوو.**

**ئافەرین! بەیەکەم دەرچــــووی.**

شـێوازی دووەم: ڕسـتەی سەرسـوڕمانی کـە بـۆ حاڵـەتی ناخۆشـی بـەکاردێت، لـەم جـۆرەدا قسـەکەر هەسـتی ناخۆشـی خـۆی بـەرانبەر بـە دیاردەیـەکی دەوروبـەر دەردەبڕێت. لـەم حاڵەتەشدا وشە سەرسوڕمانەکانی (ئاخ، ئۆف، پـەکو، ئـای،.....) بەکاردێ، ئەمجۆرە بۆ داشۆرین و شکاندن و لایەنی خراپەکاری بەکاردێت. وەك:

**ئاخ! لەم مـنداڵــە.**

**ئۆف ! لە کچی ئەم زەمانە.**

لە زمانی کوردیدا ڕستەی سەرسوڕمانی بە دوو حاڵەتی جیاواز دروست دەبێت:

یەکـەم/ بـەهۆی وشـەی سەرسـوڕمانییەوە ڕسـتەکە دروسـتدەکرێت، لـەم جـۆرە نیشانەی سەرسوڕمانی دەکەوێتە دوای وشەی سەرسوڕمانییەکەوە.وەك:

ئـافەرین! بەیەکەم دەرچووی.

دووەم/ بەبێ بەشداربوونی وشـەی سەرسـوڕمانی ڕسـتەکە دروسـت دەکرێت،چـونکە لەم جۆرەدا بەڕێگەی ئـاوازەوە ڕسـتەکە دروستدەکرێت. لـەم حاڵەتەشـدا نیشـانەی سەرسوڕمانی دەکەوێتە کۆتایی ڕستەکەوە. وەك:

**خـانوویەکی گـەورەیـە!**

**ماڵێکی خۆشە!**

**دووەم: جۆرەکانی ڕستە لەڕووی پێکهاتنەوە ( فۆرم، ڕۆنان، دروستبوون [1]**

**١ـ ڕستەی سادە:**

**أ.سادەترین ڕستە**

**ب.ڕستەی سادەی ئاسایی**

**جـ.ڕستەی سادەی فراوانکراو**

**٢ـ ڕستەی لێکدراو:**

**أ.ڕستەی لێکدراوی هاوڕێك**

**ب.ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردە**

**جـ. ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە**

**د . ڕستەی لێکدراوی نەرێنی**

**٣ـ ڕستەی ئاڵۆز:**

**أ.شاڕستە**

**ب.پاڕستە**

لە زمانی کوردیدا جۆرەکانی ڕستە لەڕووی پێکهاتنەوە دەبێتە سێ جۆر:

**١ـ ڕستەی سادە:**

بەو ڕستانە دەوترێت کە لە یەك ڕستە پێکدێن، یاخود بەو ڕستانە دەگوترێت، کە تەنیا کارێکیان تێدایە، یاخود بەو ڕستانە دەوترێت کە لە ڕەگی کار و پێویستیەکانی پێکدێت. کەواتە ڕستەی سادە ڕستەیەکە تەنیا کارێکی تێدا ئەنجام دەدرێت.

---

- بۆ ئەم تەوەرەیە پشت بەم سەرچاوەیە بەستراوە: عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول(د)(٢٠٠٦)، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، ل٤١.

ڕستەی سادەش سێ جۆرە:

**أـ سادەترین ڕستە:** بەو ڕستانە دەوترێت کە لەیەك وشە پێکدێن، وەك:

**ڕۆیشت.**

**کەوت.**

**مرد.**

**ب ـ ڕستەی سادەی ئاسایی:**

بەو ڕستانە دەوترێ کە تەنیا کارێکیان تێدایە، لەهەمان کاتیشدا ئەم ڕستانە تەنیا کەرەستە سەرەکییەکانی ڕستە دەگرێتەخۆ، ئەم کەرەسە سەرەکیانەش لەهەر سێ حاڵەتی (کاری تێپەڕ، کاری تێنەپەڕ، کاری ناتەواو ) بەکاردێت.

**کاری تێپەڕ ←—— بکەر + بەرکاری ڕاستەوخۆ + کاری تێپەڕ**

کارزان ئۆتومبێلەکەی کڕی.

بکەر ب.ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

ـ سیروان وانەکەی خوێند.

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

**کاری تێنەپەڕ ←—— بکەر + کاری تێنەپەڕ**

شیلان هات.

بکەر کاری تێنەپەڕ

ـ نازدار مرد.

بکەر کاری تێنەپەڕ

ـ سۆران نوستووە.

بکەر کاری تێنەپەڕ

**کاری ناتەواو ←—— نیهاد + گوزارە**

ئـەحـمەد زیـرەکـــــە.
نیهاد گوزارە کاری ناتەواو
- بـەنـاز جـوانـــــە.
نیهاد گوزارە کاری ناتەواو

**جـ/ ڕستەی سادەی فراوانـکراو:**

بەو ڕستانە دەگوترێت کە جگە لە کەرەسـە سـەرەکییەکان، ئـەوە کەرەسـەی لاوەکی بەشداری لە فراوانکردنی ڕستەکە دەکەن، وەك:

**- دوێنێ ئێوارە ئەحمەد نانی بە کەوچك خـوارد.**

**- بـەناز بەهـۆی ئـوتومبێلەکـــەوە مــرد.**

**- شەماڵ بەهۆی ئامادەنەبوونی یەکێك لە یاریزانەکانیان یارییەکەیان دۆڕانـد.**

**٣- ڕستەی لـێکدراو:**

بەو ڕستانە دەگوترێت کە لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت، یاخود بەو ڕسـتانە دەوترێت کە زیاتر لە کارێکیـان تێدایـە، یـاخود بـەو ڕسـتانە دەوترێـت کـە ئـامرازی لێکدەر بەشداری لە دروستکردنی ڕستەکە دەکات. لە ڕستەی لێکدراودا ئامرازەکانی لێکدەر ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە دەست نیشانکردنی جۆری ڕستە لێکدراوەکان.

***جۆرەکانی ڕستەی لێکدراو لە زمـانی کـوردیـدا:***

لە زمانی کوردیدا دەست نیشانکردنی جۆرەکانی ڕسـتەی لێکـدراو بـە ئـامرازی لێکدراوەوە بەستراوەتەوە و چوار جۆر ڕستەمان هەیە:

### أ/ ڕستەی لێکدراوی هاوڕێك:

جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستەی لێکدراو، لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت و بەهۆی ئامرازی لێکدەرەوە دروستدەکرێت. ئەم جۆرە ڕستەیە لە ڕووی ئەنجامدانی کاری ڕستەکانیان هاوڕێکن و بە زۆری کاری ڕستەکان لە شێوەی ئەرێدا دەبینرێن و هەمان ئاراستە وەردەگرن.[1] ئەو ئامرازانەی بەشداری لە دروستکردنی ڕستەی لێکدراوی هاوڕێکدا دەکەن، بریتین لە: ( و ـ، ـ هەروەها ـ ئینجا ـ ش ـ......هتد).

**ئازاد ڕۆیشت و محەمەد هات.**

**بەناز، شیلان و ئەحمەد دەرچوون.**

**کارزان مرد ئینجا ئەحمەد مرد.**

**شەماڵ و هەردی هاتن.**

### ب/ ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردە:

جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستەی لێکدراو، لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت، لەم جۆرە ڕستانەدا تەنیا یەکێك لە کارەکان لە شێوەی هەڵبژاردن جێبەجێدەکرێن. ئەوئامرازانەی کە لە ڕستەی لێکدراوی هەڵبژاردن بەشداری دەکەن بریتین لە: (یان .... یان، یا .... یا، یا، چ.....چ......).

**یان بڕۆ یان دانیشە.**

**یا بخوێنە یا واز لە خوێندن بێنە.**

**بڕۆ یا دانیشە.**

---

[1] - عەبدوڵلا حوسێن ڕەسوڵ(د)(٢٠٠٦)، ل ٤٧.

**چ گۆڤارەکەم بۆ بهێنی، چ کتێبەکە.**[1]

## جـ/ ڕستەی لێکدراوی پێچەوانە:

جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستەی لێکدراو، لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت، ئەم ڕستەیە پێچەوانە و دژایەتی نێوان دوو دیاردە، ڕووداو، بیر نیشاندەدات.[2] بەو واتایەی ڕستەی دووەم پێچەوانەی ڕستەی یەکەم دەبێت، لەم جۆرە ڕستەیەدا ئامرازەکان بریتین لە: (بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەرچی، کەچی،......).وەك:

**شیلان زیرەکە بەڵام ناخوێنێ.**

**یانەی ڕیاڵ مەدرید یانەیەکی بەهێزە، لەگەڵ ئەوەشدا جامەکەی نەهێنا.**

## د/ ڕستەی لێکدراوی نەرێنی (نەفی):

جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستەی لێکدراو، لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت، ئەم ڕستانەش لەشێوەی نەرێدا دەبینرێن و هیچیان جێبەجێ ناکرێن، ئامرازی (نە ....نە) ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە دروستکردنی ڕستەی لێکدراوی نەرێنی.

**نە دەڕوات نە دادەنیشێ.**

**نە دەخوێنێ نە واز دەهێنێ.**

**نە شاییکەرم نە شاباشدەرم.**[3]

---

[1] ـ یوسف نوری محەمەدئەمین(٢٠١٠)، هەندێ لایەنی ڕستەی لێکدراو لە زمانی کوردیدا ـ بەپێی یاساکانی گوێزانەوە، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین، ل٦٥.

[2] ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، ل١٩١ .

[3] ـ یوسف نوری محەمەدئەمین(٢٠١٠)، ل ٦٥.

**٣- ڕستەی ئاڵۆز:**

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی ڕستەی ئاڵۆز، ئەوە زاراوەکانی ( ڕستەی تێکەڵ، ڕستەی ئاوێتە ) بەکاردێت، کە هەر هەمان مەبەست دەگەیەنن.

ڕستەی ئاڵۆزیش بەو ڕستانە دەوترێت کە لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێن و بەهۆی ئامرازی لێکدەرەوە ڕستەکان لێکدەدرێن. لە ڕستەی ئاڵۆزدا دوو جۆر ڕستە دەبینرێت، کە بریتین لە: ( شارستە و پارستە ).

شارستە: ڕستەیەکی سەرەکییە و بە تەنیا بەکاردێت و بە تەنیا واتا دەبەخشێت.

پارستە (ڕستەی شوێنکەوتوو، لاڕستە، ڕستەی دیارخەر): ڕستەیەکی ناسەرەکییە،چونکە تەنیا ڕۆڵی دیارخەر دەبینێ و بە تەنیاش بەکارنایەت و واتا نابەخشێ، بەڵکو واتاکەی بە واتای شارستەوە بەستراوەتەوە..

وەکو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، کە ڕستەی ئاڵۆز دوو ڕستە دەگرێتەخۆ، یەکێکیان پێیدەوترێت (شارستە)، ئەویتریان (پارستە)، ئامرازە لێکدەرەکەش لە ڕستەدا دەچێتە پاڵ پارستەکەوە.

**- ئەحمەد کە هاندەرێکی سەرسەختی بەرشلۆنەیە، نەهاتبوو.**

شارستە ⟵ ئەحمەد نەهاتبوو.

پارستە ⟵ کە هاندەرێکی سەر سەختی بەرشلۆنەیە.

**- کەرکوك کە لەمێژوودا بە ئارابخا ناسرابوو، شارێکی کوردستانییە.**

شارستە ⟵ کەرکووك شارێکی کوردستانییە.

پارستە ⟵ کە لەمێژوودا بە ئارابخا ناسرابوو.

**- هەولێر کە پایتەختی کوردستانە،شارێکی خۆشە.**

شارستە ⟵ هەولێر شارێکی خۆشە.

پارستە ⟵ کە پایتەختی کوردستانە.

**سلێمانی کە مەڵبەندی ڕۆشنبیرانە، شارێکی گەشتیارییە.**

شارستە ⟵ سلێمانی شارێکی گەشتیاریە.

پارستە ⟵ کە مەڵبەندی ڕۆشنبیرانە.

پارستە هەمیشە لە ڕستەدا دەبێتە دیارخەر بۆ شارستە، بە واتایەکی تر پارستە ڕۆڵی ڕوونکردنەوەی شارستە دەبینێت لە ڕستەدا.

بەشێوەیەکی گشتی شارستە لە سەرەتای ڕستەدا دێت، بەڵام دەشێ پارستە لە سەرەتای ڕستەدا بێت، وەك:

**- کە بەهار هات، دەچینە سەیران.**

پارستە ⟵ کە بەهار هات

شارستە ⟵ دەچینە سەیران

## جۆرەکانی پارستە

لە زمانی کوردیدا پارستە بەسەر چوار جۆری سەرەکی دابەشدەکرێت، بەمشێوەیەی خوارەوە:

## یەکەم / پارستەی ناوی

ئەو جۆرە ڕستە لاوەکی و دیارخەرانە دەگرێتەوە، کە ناوێك لە ناوەکانی نێو شارستەکە پتر ڕووندەکاتەوە. پارستەی ناویش بەگوێرەی ئەرکی ناوی شارستەکەوە جۆرەکەی دیاری دەکرێت، کە بەمشێوەیە:[1]

---

[1] - عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ(د)(٢٠٠٦)، ل ٣٧-٤٠.

**١- پاڕستەی دیارخەری بکەر:**

لەمجۆرەدا ناوی نێو شاڕستەکە ئەرکی بکەری هەیە، بۆیە پاڕستەکەش ئەم ناوە زیاتر ڕووندەکاتەوە و دیاری دەخات و ئەرکی بکەر دەبینێت. وەك:

**- ڕژێمی بەعس که ئێستا له زبڵدانی مێژوو دایه، نیو سەدە کوردی چەوساندەوە.**

لەم ڕستەیەدا پاڕستەی (کە ئێستا لە زبڵدانی مێژوو دایە)، بۆتە دیارخەری بکەری وشەی(ڕژێمی بەعس)ی نێو شاڕستەکە.

**٢- پاڕستەی دیارخەری بەرکاری ڕاستەوخۆ:**

لەمجۆرەدا ناوی نێو شاڕستەکە ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆی هەیە، بۆیە پاڕستەکەش ئەم ناوە زیاتر ڕووندەکاتەوە و دیاری دەخات و ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەبینێت. وەك:

**سەددام هەڵەبجەی بۆردوومانکرد، که هێرۆشیمای کوردستانه.**

لەم ڕستەیەدا پاڕستەی(کە هێرۆشیمای کوردستانە)، بۆتە دیارخەری بەرکاری ڕستەوخۆی وشەی (هەڵەبجە)ی نێو شاڕستەکە.

**٣- پاڕستەی ئەرکی دیارخەری بەرکاری ناڕاستەوخۆ:**

لەمجۆرەدا ناوی نێو شاڕستەکە ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆی هەیە، بۆیە پاڕستەکەش ئەم ناوە زیاتر ڕووندەکاتەوە و دیاری دەخات و ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینێت. وەك:

**ئازاد بە ئوتومبێلەکەی کە تازەی کڕیبوو، هات.**

لەم ڕستەیەدا پاڕستەی(کە تازەی کڕیبوو)، بۆتە دیارخەری بەرکاری ناڕاستەوخۆی وشەی (ئوتومبێلەکە)ی نێو شاڕستەکە.

**٤ـ پاڕستەی ئەرکی دیارخەری نیهاد:**

لەمجۆرەدا ناوی نێو شاڕستەکە ئەرکی نیهادی هەیە، بۆیە پاڕستەکەش ئەم ناوە زیاتر ڕووندەکاتەوە و دیاری دەخات و ئەرکی نیهاد دەبینێت. وەك:

**هەولێر کە پایتەختی کوردستانە، شارێکی خۆشە.**

لەم ڕستەیەدا پاڕستەی(کە پایتەختی کوردستانە)، بۆتە دیارخەری نیهادی وشەی (هەولێر)ی نێو شاڕستەکە.

## دووەم / پـاڕستەی کـــاری:

ئەو جۆرە ڕستە لاوەکی و دیارخەرانە دەگرێتەوە، کە کاری شاڕستەکە پتر ڕووندەکاتەوە. بەگوێرەی چۆنیەتی ڕوونکردنەوەکەش، پاڕستەی کاری بۆ ئەم جۆرانەی خوارەوە دابەشدەکرێت:

**١ـ پاڕستەی کـــات:**

بەو پاڕستانە دەوترێت، کە کاتی شاڕستەکە نیشاندەدات[1]، لەمجۆرەدا کاتی ڕوودانی کاری پاڕستە زانراوە و بەهۆی ئەوەوە کاتی ڕوودانی کاری شاڕستەش دەزانرێ و دەتوانرێ پاڕستە و شاڕستە پاش و پێش بکرێن. لەمجۆرەدا بەزۆری ئامرازی لێکدەری ( کە) بەکاردێت.[2] وەك:

**کە ئەو هات، من لەوێ نەبووم.**

پـاڕستە　　　شـاڕستە

**کە دەچم بۆ قوتابخانە، دەفتەرەکەم لە ناسکە وەردەگرمەوە.**

پـاڕستە　　　　　　　　شـاڕستە

---

[1] ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، ل١٨٧ .

[2] ـ عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، ل٤١.

### ٢ـ پاڕستەی هـــۆ:

بەو پاڕستانە دەوترێت، کە هـۆی ڕوودانـی کـاری شاڕسـتەکە نیشـاندەدەن. لەمجۆرەدا ئامرازە لێکدەرەکانی ( چونکە، لەبەرئەوەی....) بەکاردێن[1]. وەك:

**چونکە یەکناگرین، سەرناکەوین.**

پـاڕستە شـاڕستە

**ناکرێ بەجێی بێلم، چونکە زۆر نەخۆشە .**

شـاڕستە پـاڕستە

### ٣ـ پاڕستەی ئەنجام:

بـەو پاڕسـتانە دەوترێـت، کـە ئـەنجامی کـاری شاڕسـتەکە دەردەخـات، لەمجۆرەدا ئامرازی لێکدەری ( بۆیە) بەکاردێت. وەك:

**یەکناگرین، بۆیە سەرناکەوین.**

شاڕستە پاڕستە

**نازەنین باش دەخوێنێ، بۆیە بەیەکەم دەردەچێ .**

شاڕستە پاڕستە

### ٤ـ پاڕستەی ئامانج:

بەو پاڕستانە دەوترێت، کە ئامانجی ڕوودانی کـاری شاڕسـتەکە دەردەخـات. لـەمجۆرەدا ئـامرازە لێکـدەرەکانی( تـا، هـەتا، تـاکو، هـەتاکو، بـۆ ئـەوەی ......) بەکاردێت. وەك:[2]

[1] ـ هەمان سەرچاوە، ل ٤١ .

[2] ـ عەبدوڵلا حوسێن ڕەسوڵ، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، ل ٤٢.

**کورد تێدەکۆشێت، بۆ ئەوەی مافی خۆی بەدەست بهێنێت.**

شـارستە پـارستە

**٥- پارستەی مـەرج:**

بەو پارستانە دەوترێـت، کـە مـەرجی ڕوودان و دیـاردەی کـاری شارسـتەکە ئاشکرا دەکات. لەمجۆرەدا ئامرازە لێکدەرەکانی( ئەگـەر، گـەر ......) بـەکاردێت. وەك:

**ئـەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مـەبـە.**

پـارستە شـارستە

**٦- پارستەی نیاز :**

بەو پارستانە دەوترێت، کە نیاز و مەبەسـتی کـاری شارسـتەکە ئاشـکرا و ڕووندەکاتەوە. لەمجۆرەدا ئامرازی لێکدەری( کە) بەکاردێت. وەك:

**ڕەنج ڕووی لە تۆ نا، کە یارمەتییەکی بدەی .**

شـارستە پـارستە

**٧- پارستەی پێوانە :**

بەو پارستانە دەوترێت، کە ڕادە و پێوانەی کاری شارسـتەکە دەردەخـەن، واتــە بــوار و ســنووری کارکردنەکـەی دەستنیشــان دەکـەن. لـەمجۆرەدا ئـامرازە لێکدەرەکانی( کە، تا، هەتا، تاکو، هەتاکو) بەکاردێت. وەك:[1]

[1]- عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسوڵ، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، ل ٤٢.

**ڕەنج ڕووی لە تۆ نا، کە یارمەتییەکی بدەی .**

شـارستە پـارستە

## سێیەم / پارستەی ئاوەڵناوی

ئەو جۆرە ڕستە لاوەکی و دیارخەرانە دەگرێتەوە، کە واتاکەی بەندە بـە واتـای شارستەکەوە و وەسفی ناوێك لە ناوەکانی نێو شارستەکە دەکات.وەك:

**ئەو چرایەی کە ڕووناك بوو، کوژایەوە.**

شارستە ←—— ئەو چرایە کوژایەوە .

پارستە ←—— کە ڕووناك بوو.

**کچەکەم دیت کە دەشەلی .**

شارستە ←—— کچەم دیت .

پارستە ←—— کە دەشەلی.

## چوارەم / پارستەی ئاوەڵکاری

ئەو جۆرە ڕستە لاوەکی و دیارخەرانە دەگرێتەوە، کە واتاکەی بەندە بـە واتـای شارستەکەوە و وەسفی کاری شارستەکە دەکـات ( دەبـێ تێبینـی ئـەوە بکـەین کـە ئەمجۆرەیان لەگەڵ پارستەی کاری یەکدەگرێتەوە).وەك:

**کارزان دەرمانی خوارد، بەڵکو چاکبێتەوە .**

شـارستە پـارستە

**ئاواز نەهاتە قوتابخانە، چونکە نەخۆش بوو.**

شـارستە پـارستە

## بەراوردێك لە نێوان پاڕستە و شاڕستە

| پاڕستە | شاڕستە |
| --- | --- |
| ١ـ جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستەی ئاڵۆز. | ١ـ جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستەی ئاڵۆز. |
| ٢ـ ڕستەیەکی ناسەرەکییە. | ٢ـ ڕستەیەکی سەرەکییە. |
| ٣ـ بە تەنیا بەکارنایێت و بە تەنیاش واتا نابەخشێت. | ٣ـ بە تەنیا بەکاردێت و بە تەنیاش واتا دەبەخشێت. |
| ٤ـ ئامرازی لێکدەرەی لەگەڵدایە. | ٤ـ ئامرازی لێکدەرەی لەگەڵدا نییە. |
| ٥ـ پاڕستە جۆری هەیە: ناوی، کاری، ئاوەڵناوی، ئاوەڵکاری. | ٥ـ شاڕستە جۆری نییە. |
| ٦ـ پاڕستە هەمیشە شاڕستە ڕووندەکاتەوە. | ٦ـ شاڕستە، پاڕستە ڕووناکاتەوە. |
| ***ـ کە بەهار هات*** | ***ـ دەچینە سەیران*** |

## بەراوردێك لە نێوان ڕستەی سادە و ڕستەی لێکدراو

### ڕستەی سادە

١- جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی پێکهاتنەوە.

٢- لە ڕستەیەك پێکدێت.

٣- تەنیا کارێکی تێدایە.

٤- ئامرازی لێکدەری تێدا نییە.

٥- ڕستەی سادە سێ جۆری هەیە:(سادەترین ڕستە، ڕستەی سادەی ئاسایی، ڕستەی سادەی فراوانکراو).

٦- ڕستەیەکە و واتادارە.

٧- جۆرەکانی ڕستەی سادە بەهۆی کورتی و درێژییەوە دیاری دەکرێن.

- *ئازاد ڕۆیشت.*

### ڕستەی لێکدراو

١- جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕستە لە ڕووی پێکهاتنەوە.

٢- لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت.

٣- زیاتر لە کارێکی تێدایە.

٤- بەهۆی ئامرازی لێکدەرەوە ڕستەکان لێکدەدرێن.

٥- ڕستەی لێکدراو چوار جۆری هەیە:(هاوڕێك، هەڵبژاردن، پێچەوانە، نەرێنی).

٦- ڕستەکانی نێو ڕستەی لێکدراو واتا دەبەخشن،چونکە دەتوانین لەشوێنی تردا بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەکاریان بێنین.

٧- جۆرەکانی ڕستەی لێکدراو بەهۆی ئامرازەکانەوە دیاری دەکرێن.

- *ئازاد ڕۆیشت و محەمەد هات .*

## بەراوردێك لە نێوان ڕستەی لێکدراو و ڕستەی ئاڵۆز

| ڕستەی لێکدراو | ڕستەی ئاڵۆز |
|---|---|
| ١ـ لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت. | ١ـ لە دوو ڕستە یان زیاتر پێکدێت. |
| ٢ـ زیاتر لە کارێکی تێدایە. | ٢ـ زیاتر لە کارێکی تێدایە. |
| ٣ـ بەهۆی ئامرازی لێکدەرەوە ڕستەکان لێکدەدرێن. | ٣ـ بەهۆی ئامرازی لێکدەرەوە ڕستەکان لێکدەدرێن. |
| ٤ـ ڕستەی لێکدراو چوار جۆری هەیە:(هاوڕێك، هەڵبژاردن، پێچەوانە، نەرێنی). | ٤ـ ڕستەی ئاڵۆز دوو جۆری هەیە (شاڕستە، پاڕستە ). |
| ٥ـ ڕستەکانی نێو ڕستەی لێکدراو واتا دەبەخشن،چونکە دەتوانین لەشوێنی تردا بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەکاریان بێنین. | ٥ـ لە ڕستەی ئاڵۆزدا تەنیا شاڕستە واتا دەبەخشێت،چونکە لەشوێنی تردا دەتوانین بەشێوەی سەربەخۆ بەکاری بێنین.کەچی پاڕستە واتا نابەخشێ،چونکە ناتوانێت بە تەنیا بەکاربێت. |
| ٦ـ ئامرازی لێکدەر پەیوەندی بە هیچ یەکێك لە ڕستەکانی نێو ڕستەی لێکدراوەوە نییە. | ٦ـ ئامرازی لێکدەر پەیوەندی بە پاڕستەوە هەیە و لەگەڵیدا دێت. |
| ***ـ ئازاد ڕۆیشت و محەمەد هات.*** | ***ـ کە ئەو هات، من لەوێ نەبووم.*** |

## کەرەســـەکانی ڕستە

### ١ـ کەرەســـە ســـەرەکــییەکــانی ڕستە

بەو کەرەسانە دەوترێت کە لـە ڕسـتەدا بوونیـان هەیـە، بـەجۆرێك ئەگـەر کەرەسەکان لە ڕۆنانی سەرەوەشـدا دەرنەکـەون، ئـەوە دەبـێ لـە ڕۆنـانی ژێـرەوەدا دەرکەون و بوونیان هەبێت. کەرەسە سەرەکییەکانیش لە زمانی کوردیدا بـە خـودی کارەوە بەستراوەتەوە و بەسەر سێ حاڵەت دابەشدەکرێت:

**١ـ لە کاری تێپەڕدا ◄ـــــــ بکەر + بەرکاری ڕاستەوخۆ + کاری تێپەڕ**

کارزان ئوتومبێلەکەی کـــڕی.

بکەر ب.ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

**٢ـ لە کـاری تێنەپەڕدا ◄ـــــــ بکەر + کاری تێنەپەڕ**

شـیلان هـــات.

بکەر کاری تێنەپەڕ

**٣ـ لە کـاری ناتەواودا ◄ـــــــ نیهاد + گوزارە**

ئـەحـمەد زیــرەکـــــە.

نیهاد گوزارە

وەکو ئاماژەمان بۆی کرد، دەشێ ئەم کەرەسانە لە ڕۆنانی سەرەوەدا دەرنەکەون، بەڵام لە ڕۆنانی ژێرەوەدا بوونیان هەیە. وەك:

| | | |
|---|---|---|
| خواردی. | کەوت . | پاکە . |
| بردی. | خەوت . | جوانە . |
| هێنای. | مرد . | خراپە . |

**٢ـ کەرەسە لاوەکییەکانی ڕستە:**

بەو کەرەسانە دەوترێت، کە دەشێ لە ڕستەدا دەرنەکەون یاخود ئەگەر لە ڕستەشدا بوونیان هەبێ، دەشێ لە ڕستەکە لایانبەرین، بە بێ ئەوەی واتای ڕستەکە تێکبدات، کەرەسەکانیش بریتین لە:( ئامراز، پێشبەند، ئاوەڵکار، ڕادە........).وەك:

**کارزان بە کەوچك نان دەخوات .**

کەرەسەی سەرەکی ⟵ کارزان نان دەخوات .

کەرەسەی لاوەکی ⟵ بە کەوچك

**شیرین دوێنێ ئێوارە بە ئۆتۆمبیلێکی زۆر جوان هات .**

کەرەسەی سەرەکی ⟵ شیرین هات .

کەرەسەی لاوەکی ⟵ دوێنێ ئێوارە بە ئۆتۆمبیلێکی زۆر جوان

**شەونم کچێکی باڵابەرزی چاوشینی قژزەردی جوانە .**

کەرەسەی سەرەکی ⟵ شەونم جوانە .

کەرەسەی لاوەکی ⟵ کچێکی باڵابەرزی چاوشینی قژزەردی

# بکەر

بکەر وەکو حاڵەتێکی زمانی گشتییە، بەهۆیەوە لە زۆربەی زمانەکاندا هەمان پرۆسە ئەنجام دەدات. لە زمانی کوردیدا زمانەوانان و نووسەرانی کورد چەندین پێناسەی جودا جودایان بۆ ئەم دیاردەیە کردووە[(١)]، وەك ئەوەی (بکەر) دەبێت کەسێك یان شتێك بێت، کە ئەنجامدانی یان ئەنجام نەدانی کارێکی بکەوێتە ئەستۆ، یاخود تەنیا بۆشایی و شوێنی بکەر لە ڕستەی کوردیدا پڕ دەکاتەوە.

کاتێك کە دەڵێین ( کەسێك)، ئەوا مەبەستمان لە خودی (مرۆڤ ـ تاك)ە، کە بە پرۆسەی کارەکە هەڵبستێت، وەك :

شەوبۆ چوو بۆ دهۆك .

↓

بکەر

لەم ڕستەیەدا وشەی ( شەوبۆ) ناوێکە، ناوی (مرۆڤـ )ە، خۆی بە ئەنجامدانی کارەکە هەستاوە و چووە بۆ شاری دهۆك، لێرەدا پێویستیمان بەوە نییە بزانین، کە چۆن چووە بۆ شاری دهۆك ؟ یاخود بەچی چووە ؟! بەڵکو تەنیا

---

(١) ـ نوری عەلی ئەمین دەڵێت: (( مسند الیه ئەو بەشەیە لە ڕستەدا، کە ئاخاوتنەکەی ئەدرێتە پاڵ، یەعنێ ئەو واژەیە یا دەستەواژەیەیە کە ئێمە لێ ی ئەدوێین )) بڕوانە: قەواعدی زمانی کوردی لە صرف و نەحودا، بەرگی دووەم، ١٩٥٨، ل ١٥ .

ـ جگەر خوێن دەڵێت: (( دەستپێکراو ئەو پەرچە ناڤە کو هەردەم گەرەکە دپێشیا پەیڤی دەژێ بێ سالۆخ دان)) بڕوانە: اوائو دەستورا زمانی کوردی، ١٩٧٦، ل٣.

ـ قەناتی کوردۆ دەڵێت: (( خودان فێل ئەو خەبەرە یاکو نیشان دکە وی مەری یانی ژی وی شتی یێ کو دەرهەتاویدا تشتەك جوملێدا تێگوتنێ )) بڕوانە: گۆڤاری کۆڕێ زانیاری عێراق — دەستەی کورد، بەرگی چواردەهەم، ١٩٨٢، ل ١٧٤.

ئـەوەمان گەرەکـە بـزانین ناوەکـە نـاوی مرۆڤێکـە بـە کارەکـە هەسـتاوە، یـاخود بەپێچەوانەوە، مرۆڤەکە کارەکە ناکات و ئەنجامی نادات، وەك :

سۆزان کارەکە ناکات .

↓

بکەر

لێرەدا (سۆزان) ناوی مرۆڤێکە، بکەری ڕستەکەی گرتۆتە ئەستۆ، بەڵام بەبێ بـەجێ گەیاندنی کارەکە، واتا کارەکەی جێبەجێ نەکردووە .

هەروەها کاتێك دەڵێین ( شتێکە)، ئەوا لێرەدا مەبەسـتمان (مرۆڤــ) نییـە، بـەڵکو شتێکی دوور لە مرۆڤـ و بێگیان، کە کارەکە هەڵسوڕێنێت و ئەنجامی بدات، وەك:

بارانەکە باخچەکەی تێکدا .

تەزرەکە میوەکەی لەناوبرد .

ڕەشەباکە کەپرەکەی ڕووخاند .

لـەم ڕسـتانەدا وشـەکانی (بارانەکـە، تەزرەکـە و ڕەشـەباکە) هـەر یەکـەیان نـاوێکی ناسراون، بەڵام ناوی مرۆڤـ نین و، دەچنە خانەی ناوی شت و بێگیانن، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا هەریەکـەیان بـە ئەنجامـدان و هەڵسـوڕانی کارێـك هەسـتاون، کـە بەمـەش ئەرکی بکەری ڕستەکەیان بەجێ گەیاندووە، بەجۆرێك لە ڕستەی یەکەمدا (بارانەکە ) وای کردووە ببێتە هۆکارێك بـۆ ئـەوەی باخچـەکە تێکبـدات و، لـە ڕسـتەی دووەمـدا وشەی (تەزرەکە) بکەری ڕستەکەیە، بۆتە هۆی ئەوەی میوەکان لەناو ببات و، ئێمـە لێرەدا گەرەکمان نییە بزانین ( تەزرەکـە ) دانـەی چـەند گـەورە بـووە ؟ یـان چـەند کاتژمێری خایاندووە ؟ بەڵکو تەنیا مەبەستمان ئەوەیە،کە ئەم شتە شتێکی بێگیانـە و مرۆڤـ نییە و، ئەرکی بکەری لە ڕستەکەدا بەجێ گەیاندووە، لـە ڕسـتەی سـێیەمدا

وشەی ( ڕەشەباکە ) بۆتە هۆی ئەوەی کەپرەکە بڕووخێنێت، هەروەها لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە بزانین ئەم ڕەشەبایە لە چ پلەیەکی بەهێزدا بووە؟ یان کەپرەکەی کامە ماڵی ڕووخاندووە، بەڵکو تەنیا گەرەکمانە دەست نیشانی بکەری ڕستەکە بکەین، کە شتێکی بێگیانە .

هەروەها دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە لە ڕستەی ئاسایی زمانی کوردیدا (بکەر) لەسەرەتای ڕستەدا دێت و، کار دەکەوێتە بەشی دواوەی ڕستە، وەك:

گۆڤەند نانەکەی خوارد .

↓ ↓ ↓

بکەر بەرکار کار

بکەر لە زمانی کوردیدا دەشێت ناوێکی ( تایبەت، گشتی، ناسراو، نەناسراو، تاك، کۆ، ... هتد ) بێت، هەر وەکو ئەم ڕستانەی خوارەوە:ـ

ڕێناز ڕۆیشت بۆ کۆلێژ .

↓

(بکەر)

(ناوی تایبەتی ناسراو )

کوڕەکە دانیشت.

↓

بکەر

( ناوی تاکی ناسراو)

کچێکی زۆر جوان ڕۆیشت .

↓

بکەر

(ناوی تاکی نەناسراو)

منداڵەکان هاتن .

↓

بکەر

( ناوی کۆی ناسراو)

هەروەها دەشێت ( بکەر) لەناو ڕستەدا جێناو بێت، ئینجا جێناوی سەربەخۆ بێت یان لکاو یان......، وەك :

ئــــــەو گوڵ دەفرۆشێت.

↓

بکەر

(جێناوی سەربەخۆ بۆ کەسی سێیەمی تاك).

نانم خوارد .

↓

بکەر

(جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك ).

خۆم کارەکە دەکەم .

↓

بکەر

(جێناوی خۆیی بۆ کەسی یەکەمی تاك ).

خاڵێکی گرنگ هەیە، دەمانەوێت لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەین، ئەویش ئەوەیە کە ( بکەر) دەچێتە ناو خانەی بەشە ئاخاوتنی (ناو)، هەروەها وەکو لە پێشەوەش ئاماژەمان بۆی کرد، کە (بکەر) لە زمانی کوردیدا لە پێش (کار) دێت، بەو مەرجەی جێناوی لکاو نەبێت، واتا وشەیەك بێت، وەك :

بێریڤان گوڵ دەفرۆشێ .

↓ ↓

بکەر کار

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك جار دەکەوێتە دواوەی کار، ئەگەر هاتوو بکەری ڕستەکە جێناوی لکاو بوو، وەك :

سێو دەخۆ م .

کار بکەر

**جۆرەکانی بکەر**

لە زمانی کوردیدا بکەر بەسەر پێنج جۆر دابەشدەکرێت:

**١ـ بکەری ڕێزمانی**
**٢ـ بکەری لۆجیکی**
**٣ـ بکەر دیار**
**٤ـ بکەر نادیار**
**٥ـ بکەر نادیاری ئاماژە پێکراو**

**١ـ بکەری ڕێزمانی**

بەو بکەرانە دەگوترێ کە لەڕووی ڕێزمانەوە بکەرن، واتە بکەری ڕاستەقینەی ڕستە نین، بەڵکو تەنیا شوێنی بکەریان لە ڕستەدا پڕ کردۆتەوە.بۆ نموونە:

**پەنجەرەکە شکا.**
**کەپرەکە ڕووخا.**
**دۆیەکە ڕژا.**
**پوشەکە سوتا.**

لەم ڕستانەی سەرەوەدا وشەکانی (پەنجەرەکە، کەپرەکە، دۆیەکە، پوشەکە) بکەری ڕێزمانی ڕستەکەن، بەڵام لەبنەڕەتدا خۆیان کارەکانیان ئەنجام نەداوە، چونکە لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (پەنجەرەکە) کاری شکاندنی ئەنجام نەداوە و، لە ڕستەی دووەمیشدا بەهەمان شێوە وشەی (کەپرەکە) کاری ڕووخاندنی ئەنجام نەداوە و، لە ڕستەی سێیەمیشدا وشەی (دۆیەکە) کاری ڕژاندنی

ئەنجامنەداوە و، لە ڕستەی چوارەمیشدا وشەی (پوشەکە) کاری سوتاندنی ئەنجام نەداوە. کەواتە لە هەر چوار ڕستەکەدا بکەری ڕاستەقینە و بکەری لۆجیکی دەرنەکەوتوونە، بۆیە لێرەدا وشەکانی(پەنجەرەکە، کەپرەکە، دۆیەکە، پوشەکە) تەنیا لە ڕووی ڕێزمانەوە بکەرن.

کەواتە بکەری ڕێزمانی بەو بکەرە دەوترێت، کە تەنیا بۆشایی و شوێنی بکەر لە ناو بنیادی ڕستەدا پڕبکاتەوە و تەنیا خانەی بکەر دەگرێتەوە[1].

## ٢ـ بکەری لۆجیکی

بەو بکەرانە دەوترێت، کە لە ڕووی واتاوە ئەرکی بکەر بەجێ دەگەیەنن، بەو واتایەی کە بکەری ڕاستەقینەی کارەکەیە. ئەمجۆرە بکەرە هەندێجار لە شوێنی ئاسایی خۆیان دێن، بەڵام هەندێجاری تر لە شوێنی بکەری ئاسایی بەکار ناهێت [2]، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە با سەیری ئەم ڕستەیەی خوارەوە بکەین :

ئاهەنگ دەنگی ڕزگار دەبیستێ[3].

لەم ڕستەیەدا ئەگەر (بکەر) و(بەرکار) دەستنیشان بکەین، بەبێ لەبەرچاو گرتنی لایەنی واتایی ڕستە، ئەوا ( ئاهەنگ) بکەری ڕستەکەیە و (ڕزگار) بەرکارە، بەڵام ئەگەر لە ڕووی واتاوە بۆ ڕستەکە بچین، ئەوا دەبینین ( ڕزگار) بکەرە و، (ئاهەنگ) بەرکارە، چونکە ( ڕزگار) قسە دەکات و کار لە ( ئاهەنگ) دەکات دەنگەکە ببیسێت، بەمەوە بۆمان دەردەکەوێت،کە ( ئاهەنگ) بکەری ڕێزمانییە و، ( ڕزگار) بکەری لۆجیکییە .

(١) محمد على الخولى(١٩٨٢)، معجم علم اللغة النظري، الانكليزى – عربى، مكتبة لبنان، بيروت،ص ١١١.

(١) هەمان سەرچاوە، ل١٦٠.

(٢) وريا عمر امين، تێنەپەڕ فرمانێکی بکەر نادیارە، ل ١٩٧.

هەروەها دەشێ بکەر لە شوێنی ئاسایی خۆی بێت، وەك:

**کاروان هات.**

**شێرزاد ڕۆیشت.**

**ئەحمەد سەرکەوت.**

**بەراوردێك لەنێوان بکەری ڕێزمانی و بکەری لۆجیکی**

| بکەری ڕێزمانی | بکەری لۆجیکی |
|---|---|
| ١- بکەر لە ڕستەدا بوونی هەیە. | ١- بکەر لە ڕستەدا بوونی هەیە. |
| ٢- لە بکەری ڕێزمانیدا بکەری ڕاستەقینە دەرنەکەوتووە، کە کاری ڕستەکەی ئەنجامداوە. | ٢- لە بکەری لۆجیکیدا بکەری ڕاستەقینە دەرکەوتووە، کە کاری ڕستەکەی ئەنجامداوە. |
| ٣- بەزۆری بکەرە ڕێزمانییەکان لەکاری تێنەپەڕدا دەردەکەون. | ٣- بکەری لۆجیکی لەهەردوو جۆری کاری تێپەڕو تێنەپەڕدا دەردەکەوێت. |
| **- پەنجەرەکە شکا** | **- ئازاد پەنجەرەکەی شکاند.** |

بەراوردێك لەنێوان بكەری ڕێزمانی و بكەر نادیار

| بكەری ڕێزمانی | بكەر نادیار |
|---|---|
| ١ـ بكەر لە ڕستەكەدا بوونی هەیە.<br>٢ـ بكەری ڕاستەقینە و سەرەكی لە ڕستەكەدا نییە.<br>٣ـ بكەرە ڕێزمانییەكە ئاماژەیەكە بۆ بكەری سەرەكی، كە دەرنەكەوتووە.<br>**ـ پەنجەرەكە شكا.** | ١ـ بكەر لە ڕستەكەدا بوونی نییە.<br>٢ـ بكەری ڕاستەقینە و سەرەكی لە ڕستەكەدا دەرنەكەوتووە.<br>٣ـ نیشانەی نادیاری ( ر ) ئاماژەیەكە بۆ ئەو بكەرەی كە لە ڕستەكەدا دەرنەكەوتووە.<br>***ـ پەنجەرەكە شكێنرا.*** |

## ٣ـ بكەردیار

لە زمانی كوردیدا زمانناسان كۆمەڵێك پێناسەیان بۆ بكەردیار كردووە، كە هەر هەموویان لە چوارچێوەی یەك بنەما كۆدەبنەوە، ئەویش دەركەوتنی ڕاستەوخۆی (بكەر)ەكەیە لەناو ڕستەدا، وەكو دەشزانین كە ئەم جۆرە (بكەر)ە، یان (ناو)ە، یاخود (جێناو)ە، كە لەناو ڕستەدا بە ڕاپەڕاندنی ئەركی خۆی هەڵدەستێت (( فۆرمی كارا دیار نیشانی دەدا پرۆتسێسی دیاری كردنی كردار لەو شتەوە دێ، كە بۆ ئەو وشەیە تەرخان كرابێ و لەگەڵیدا فۆرمی كردارەكە هاوجووت بێ و لێیەوە بەرەو ناوەوە بچێ))[1]. بۆ زیاتر ڕوونكردنەوە با سەیری ئەم ڕستانەی خوارەوە بكەین:

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی كوردی، بەرگی یەكەم (وشەسازی)، كردار، ل٣١٥.

**ڕزگار سێوەکەی خوارد .**

**پۆلا پەنجەرەکەی شکاند .**

**زانیار خانووەکەی ڕووخاند .**

**من چووم بۆ بازاڕ .**

**دەرگاکەم کردەوە .**

لەم ڕستانەی سەرەوەدا ( ڕزگار، پۆلا، زانیار، من،ـم ) هەریەکەیان لەناو ڕستەدا بکەرێکی دیارن، چونکە خۆیان بە ئەنجام دانی کارەکە هەڵساون. لە ڕستەی یەکەمدا ( ڕزگار) ناوە و بکەری ڕستەکەیە و، خۆی کاری خواردنی سێوەکەی ئەنجامداوە، لە ڕستەی دووەمدا (پۆلا) ناوە و بکەری ڕستەکەیە؛ شکاندنی پەنجەرەیەکی ئەنجامداوە، لە ڕستەی سێیەمدا ( زانیار ) ناوە و بکەری ناو ڕستەکەیە کاری ڕووخاندنی خانووی ئەنجامداوە، لە ڕستەی چوارەمدا ( من ) جێناوی سەربەخۆیە و بکەری ڕستەکەیە، کارێکی ڕاپەڕاندووە، ئەویش ڕۆیشتنێتی بۆ بازاڕ، لە ڕستەی پێنجەمدا ( ـــ م) جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك و، بکەری ناو ڕستەکەیە، کردنەوەی دەرگاکەی ئەنجامداوە.

هەردوو جۆری ( بکەری ڕێزمانی و بکەری لۆجیکی) دەچنە ناو خانەی بکەردیار، چونکە لەنێو ڕستەدا دەردەکەون.

## ٤ـ بکەر نادیار

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێك پێناسە بۆ بکەرنادیار هەیە، کە هەر هەموویان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، تەنیا ونبوون و دەرنەکەوتنی بکەرە لەناو ڕستەدا، ئەم دیاردەیەش تەنیا لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیە نییە، بەڵکو لە هەموو زمانانی دنیا بە هەمان دەستووردا دەڕوات ((دەستووری گشتی هەموو زمانێك لە گۆڕینی

ڕستەیێکی کارا دیار بۆ کارا بزر بریتییە لە دەرهاویشتنی کارا و سپاردنی ئەرك بە بەرکار ( بەلاَم بەرکار هەمان ئەرك و مەفهوومی خۆی دەمێنێ) ))[1]، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، با سەیری ئەم ڕستانە بکەین :ـ

**سێوەکە خورا .**

**پەنجەرەکە شکێنرا .**

**خانووەکە دەڕووخێنرێت .**

لەم ڕستانەدا، کارەکانی (خورا، شکێنرا، دەڕووخێنرێت)، هەریەکەیان کارێکی بکەرنادیارن، لێرەدا نازانرێت کێ هەلَساوە؟ یان هەلَدەستێت بە ڕاپەڕاندن و ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانە، لە ڕستەی یەکەمدا نازانرێت (کێ سێوەکەی خواردووە؟)، واتا بکەرەکەی نادیارە، لە ڕستەی دووەمدا نازانرێت کێ پەنجەرەکەی شکاندووە؟)، لە ڕستەی سێیەمدا نازانرێت (کێ هەلَدەستێت بە ڕووخاندنی خانووەکە). ئا بەم جۆرە ڕستانە دەوترێت بکەر نادیار. وەکو دەردەکەوێت لە هەموویاندا مەرجی بنەڕەتی ڕستەکە (بکەر) بووە، واتا (( پێوەندی ڕوودان بە بوون و نەبوونی کارا مەرجی بنەڕەتی دیاری کردنی کرداری کارا بزرە)) [2].

هەروەها لە زمانی کوردیدا، ئەگەر بمانەوێت ڕستەیەکی بکەردیار بۆ ڕستەی بکەر نادیار بگۆڕین، ئەوە دەبێت لەسەر ئەم یاسایە بڕۆیین[3]:ـ

١– بکەری ڕستە و جێناوەکەی لادەبرێت .

٢– بەرکار جێی بکەر دەگرێتەوە، بەلاَم چەمکی بەرکاری خۆی نادۆڕێنێت.

٣– ڕەگی ڕانەبوردووی کارەکە وەردەگیرێت .

---

(١) د.ئەورەحمان حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، کردار، ل ٣٢٣.

(١) هەمان سەرچاوە، ل٢٢٢.

(٢) وریا عومەر ئەمین، لە پەیوەندییەکانی بکەر نادیار، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ. (١٢٩)، ل ١٨.

٤–مۆرفێمی بکەر نادیار (ـ ر) دەخرێتە سەر ڕەگی کارەکە.

٥–مۆرفێمی کاتی کارەکە دەچێتە سەر ڕەگەکە،(ا) بۆ ڕابوردوو و، (ێ) بۆ ڕانەبوردوو.

٦–جێناوی لکاو بەپێی کەس و ژمارەی بەرکار، کە جێی بکەری گرتووە دەچێتە سەر کارەکە.

٧–نیشانەی جۆری کات (دە، بوو، ...) وەکو خۆی دەمێنێتەوە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، با سەیری ئەم نموونانەی خوارەوە بکەین :-

**ڕزگار** **سێوەکەی** **خواردبوو** . (بکەر دیار)

↓ ↓ ↓

بکەر — بەرکاری ڕاستەوخۆ — کاری ڕابوردووی دوور

**سێوەکە** **خورابوو** . (بکەر نادیار)

↓ ↓

بەرکاری ڕاستەوخۆ — بکەر نادیار ( ڕابوردووی دوور)

- **ڕێبوار دیوارەکەی ڕووخاند** . (بکەر دیار )

**دیوارەکە ڕووخێنرا** . ( بکەر نادیار بۆ ڕابوردوو)

**دیوارەکە دەڕووخێنرێ** . ( بکەر نادیار بۆ ڕانەبوردوو)

ئەو ڕستانەی، کە خرانەڕوو، کارەکانیان تێپەڕ بوو، چونکە لە زمانی کوردیدا وەکو مەرجێکی سەرەکی لە گۆڕینی ڕستەی بکەر دیار بۆ ڕستەی بکەر نادیار، دەبێت

کارەکە تێپەڕ بێت، ئینجا پرۆسەی گۆڕینەکە ئەنجام دەدرێت، بەڵام ئەگەر کارەکە تێنەپەڕ بوو، ئەوە دەبێت لەسەرەتادا بکرێتە تێپەڕ، ئینجا ڕستەی بکەر نادیاری لێ سازدەکرێت، وەك:ـ

**خانووەکە ڕووخا .**

لێرەدا (ڕووخا) تێنەپەڕە، ناکرێت بە بکەر نادیار، بەڵکو بە ڕێگەی تایبەتییەوە (ڕووخا ) دەکرێتە کارێکی تێپەڕ، وەك:

ڕووخا + اندن = ڕووخاندن

**ئازاد خانووەکەی ڕووخاند .** (بکەر دیار)

**خانووەکە ڕووخێنرا .** (بکەر نادیار)

هەروەها دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە مەرج نییە ڕستەی بکەر نادیار هەردەم لە ڕستەی بکەر دیارەوە وەرگیرابێت، بە جۆرێك لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێك ڕستەمان هەیە، کە وەك ڕستەی بکەر نادیار بەکاردێت، کەچی لە ڕستەی دیارەوە وەرنەگیراوە، وەك:

**ئەستێرە بە ڕۆژ نابینرێ .**

لێرەدا هەرگیز لە ڕستەی ( ئێمە بە ڕۆژ ئەستێرە نابینین ) وەرنەگیراوە[1]. **هەروەها** حاڵەتی ئەوتۆش هەیە، کە ئەگەرچی ڕێژەکەی هی بکەر نادیارییە و بکەرەکە ناونەبراوە، کەچی سەرچاوە و بکەر ناسراوە، بۆ نموونە، کاتێك نووسەری کتێبێك دەڵێت: وەك پێشتر نیشاندرا (لە بریتی: وەك پێشتر نیشانم دا) بێ دەنگی خۆنیشاندان لەم ڕاستییە، دەگەڕێتەوە بۆ لە خۆبووردوویی نووسەر.[2]

---

(١) فەرەیدوون عەبدول، هەمان سەرچاوە، ل٩.

(٢) د. ئەورەحمان حاجی مارف، کردار، ل ٣١٩.

## هۆکارەکانی پەنابردنە بەر بکەر نادیار

هەر کارێك کە ئەنجام دەدرێت، دەبێت کەسێك یان شتێك بۆ ئەنجامدانی هەبێت، ئینجا لەبەر هەر هۆکارێك بێت، ئەوە بکەرەکە ون دەبێت و دەرناکەوێت، بەڵکو بە شاراوەیی دەردەبڕێت، دیارە کۆمەڵێك هۆکار لە پشتەوەی دەرنەکەوتنی بکەرەکەن[1]، کە بەم شێوەیەن:

١- لەبەرئەوەی تۆ لێی دەترسێیت (خوف منه)، لێرەدا تۆ دەزانی، کە ئەنجامدەری کارەکە کێیە، بەڵام ناوی ناهێنیت، نەبادا دوایی ئازارت بدات .

٢- لەبەرئەوەی تۆ لێی دەترسێیت ( خوف علیه)، لێرەشدا دیسانەکە تۆ دەزانی، کە ئەنجامدەری کارەکە کێیە، بەڵام ناوی ناهێنیت، لەبەرئەوەی لەوە دەترسێیت کە خەڵك ئازاری بدات، واتا تۆ لەبەر بەرژەوەندیی کەسەکە ناوی نابەیت، کە ئەمەش پێچەوانەی خاڵی یەکەمە .

٣- زۆرجار لەبەر ناسراوی و زانینەوە، تۆ ناوی بکەرەکە نابەیت، چونکە لە لای بەرانبەرەکەت ڕوونە.

---

(٣) بڕوانە ئەم سەرچاوانە: ـ محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، ١٩٧٤، ل ١٣٦.

ـ د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی، ١٩٨٢، ل١٦٥ـ ١٦٦.

ـ لیژنەی دەستووری زمانی کوردی، هەندێك لە بابەتە کێشەدارەکان لە ڕێزمانی کوردیدا، ١٩٨٥، ل ٤٤.

ـ عومەر مەحموود کەریم، کاری تێپەڕو تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا، ٢٠٠٤، ل ٧١ .

ـ د. عبدة الراجحي، دروس في شروح الألفية،١٩٨٠، ص ٣٦ـ٣٧.

ـراجی الأسمر، مرجع الطلاب في اللغة العربية،١٩٩٥، ص ١٥٢.

ـ أنطوان الدحداح، مُعجم قواعد اللغة العربية في جداول ولوحات: ١٩٩٧، ص ١٤١ .

ـ أية الله الشيخ مصطفى النوراني، قواعد الصرف، ٢٠٠١، ص ١٢٤.

ـ د.فاضل صالح السامرائي، معاني النحو، جزء الثاني،٢٠٠٣، ص ٤٩٢ـ٤٩٣.

ـ شيخ مصطفى الغلاييني، جامع دروس العربية، ٢٠٠٤، ص ٢٥١.

٤- هەندێك جار پێوەندی بە هۆكاری شاردنەوە هەیە بۆ گوێگر، كە نایەوێت بیزانێت.

٥- یان لەبەر هۆكاری كورتكردنەوە دەبێت.

٦-هەندێك جاریش هەر بە ڕاستی پێوەندی بە (نەزانین)ەوە هەیە، واتا تۆ نازانیت ئەنجامدەری كارەكە كێیە .

٧-یاخود هەندێك جار ناوهێنانی هیچ سوودێكی نییە، بۆیە تۆ ناوی ناهێنیت .

٨-یاخود ناونەبردنی هەندێك جار پێوەندی بەلایەنی گەورەكردنەوە هەیە .

٩- یاخود بەپێچەوانەوە، ناونەبردنی پێوەندی بە كەمكردنەوە هەیە.

جگە لەم هۆكارانەی، كە ئاماژەمان بۆیان كرد، لەوانەیە چەندین هۆكاری تریش هەبن، لە بارەی دەرنەخستنی بكەر لەناو بنیادی ڕستەدا، كە بەهۆیەوە چەندین وەڵامی جودا جودا لەلای هەریەك لە گوێگران دروست دەبێت .

## سازكردنی بكەرنادیار لە كار

بكەرنادیار لە هەردوو كاری ڕابوردوو و ڕانەبوردوو سازدەكرێت:

### كاری ڕابوردووی بكەر نادیار

لە دەستپێكدا دەبێت چەمك و پێناسەی كاری ڕابوردوو بزانین، كە چۆنە و چۆن ساز دەبێت، ئینجا دەچینە سەر باسی كاری ڕابوردووی بكەر نادیار. دەربارەی كاری ڕابوردوو، ئەو كارەیە، كە ڕوودانەكەی دەكەوێتە پێش ئاخاوتنەوە، واتا ڕوودانی كارەكە بەسەرچووە و ڕوویداوە ((كرداری ڕابوردوو ئەو كردارەیە، كە پرۆتسێسی ڕوودانەكەی پێش ئاخاوتن بكەوێ))[1]. لە زمانی كوردیدا بۆ سازكردنی

(١) د ئەورەحمانی حاجی مارف، كردار، ل٢٠٠ .

کاری ڕابوردوو، پەنادەبرێتە بەر چاوگ، ئەمیش بە لابردنی (ن)ی چاوگ ساز دەبێت (( لە زمانی کوردیدا فرمانی ڕابوردوو بە لابردنی (ن)ی چاوگ دروست دەکرێت))[1]، لەم حاڵەتەشدا کاری ڕابوردووی نزیك دروست دەبێت، کە بە یەکێك لەم پێنج مۆرفێمە((وو، ی، د، ا، ت)) کۆتاییان دێت:

مۆرفێمی (وو) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| چوون | ـ ن | چوو | وو |
| بوون | ـ ن | بوو | وو |
| دروون | ـ ن | دروو | وو |
| چوون | ـ ن | چوو | وو |

مۆرفێمی (ی) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| کڕین | ـ ن | کڕی | ی |
| فڕین | ـ ن | فڕی | ی |
| بڕین | ـ ن | بڕی | ی |
| سڕین | ـ ن | سڕی | ی |

(٢) عبدالله شالی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی( دار الجاحظ)، ١٩٧٦، بەغدا، ل٤.

مۆرفێمی (د) : ـ

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
| --- | --- | --- | --- |
| مردن | ـ ن | مرد | د |
| کردن | ـ ن | کرد | د |
| بردن | ـ ن | برد | د |
| خواردن | ـ ن | خوارد | د |

مۆرفێمی (ا) :ـ

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
| --- | --- | --- | --- |
| سوتان | ـ ن | سوتا | ا |
| ڕووخان | ـ ن | ڕووخا | ا |
| شکان | ـ ن | شکا | ا |
| ڕژان | ـ ن | ڕژا | ا |

مۆرفێمی (ت) :

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفێمی ڕابوردوو |
| --- | --- | --- | --- |
| کەوتن | ـ ن | کەوت | ت |
| خەوتن | ـ ن | خەوت | ت |
| شوشتن | ـ ن | شوشت | ت |
| نوستن | ـ ن | نوست | ت |

لە بارەی کاری ڕابوردووی بکەر نادیار، ئەوە ئەو کارانە دەگرێتەوە، کە لەلایەن کەسێکی نەناسراو و نادیارەوە ڕوویدابێت.

یاسای سەرەکی سازکردنی کاری ڕابوردووی بکەر نادیار لە زمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست)دا، بە وەرگرتنی ڕەگی کاری ڕانەبوردوو لەگەڵ مۆرفێمی نادیاری (ـ ر) و مۆرفێمی (ـا) ی ڕابوردوو سازدەبێت، بەم شێوەیە:

**ڕەگی ڕانەبوردوو + مۆرفێمی نادیاری (ــ ر) + مۆرفێمی ڕابوردوو**

وەك :-

کێڵاَن ←——— کێڵ +ر + ا = کێڵرا

هێنان ←——— هێن + ر + ا = هێنرا

خوێندن ←——— خوێن + ر +ا = خوێنرا

چنین ←——— چن + ر +ا = چنرا

هەروەها دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت، کەوا لە حاڵەتی کاری ڕابوردووی بکەر نادیاردا، مۆرفێمی کات هەروەك خۆی دەمێنێتەوە ((نیشانەی جۆری کات ( ئە ــ بوو ــ ووە..... هتد) شوێنی خۆی ئەگرێ))[1]، هەروەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

**- ئازاد زەوییەکەی کێڵاوە. ( بکەر دیار)**

**زەوییەکە کێڵراوە. ( بکەر نادیار)**

**- ئازاد زەوییەکەی دەکێڵا. ( بکەر دیار)**

**زەوییەکە دەکێڵرا. ( بکەر نادیار )**

---

(١) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل ١٨٥

**ـ ئازاد زەوییەکەی کێڵابوو .      ( بکەر دیار)**

**زەوییەکە کێڵرابوو.      ( بکەر نادیار) ...** [1]

ئەگەرچی وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، کە سازکردنی کاری ڕابوردووی بکەر نادیار وەك یاسایەکی سەرەکی و بنچینەیی لە ڕەگی ڕانەبوردوو وەردەگیرێت، بەڵام دەشێت حاڵەتی ناوێزەی تێدا بەدی بکرێت ((هەر چەندە بوونی ڕەگی کرداری ڕانەبوردوو بە بناغەی سازکردنی کرداری کارا بزر دەستورێکی گشتی زمانی کوردییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك حاڵەتی بیژۆك و هەندێك گۆڕانی فۆنەتیکی بەرچاو دەکەوێ ))[2]، لێرەدا هەندێك لەو حاڵەتانە دەخەینە ڕوو :

١– ئەو کارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان بە (ە ) یا (ێ ) کۆتایی دێت، کاتێك کە دەکرێتە بکەر نادیار، (ە) و (ێ) تێدا دەچن، وەك:

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | دوادەنگی ڕەگ | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|
| کردن | کە | ە | کرا |
| بردن | بە | ە | برا [3] |
| (دا )نان | (دا) نێ | ێ | (دا) نرا [4] |

٢ـ ئەو کارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان بە (ۆ) کۆتایی هاتبێت، ئەوە دەبنە (و)[5]، وەك:

---

(١) نەریمان خۆشناو، چەمك و پێناسەیکارای نادیار، ل٥٩.

(٢) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل٣٣٣.

(٣) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل٣٣٥.

(٤) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل ٢٧٤.

(١) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل٣٣٤.

| | ڕەگی دوادەنگی | | کاری ڕابوردووی | |
|---|---|---|---|---|
| چاوگ | ڕانەبوردوو | ڕەگ | گۆڕان | بکەر نادیار |
| خواردن | خۆ | ۆ | و | خورا |
| شوشتن | شۆ | ۆ | و | شورا |

کەچی (فەرەیدوون عەبدول محەمەد ) لە نامەی ماجستێرەکەیدا دەڵێت: ((لە هەموو خراپ تر ئەوەیە کە یاساکانیان تەنیا لە نموونەکانیاندا ڕاستە و لە نموونەی تردا، کە لە هەمان باردان، یاساکە جێبەجێ نابێ، بۆ نموونە دەنگی / ۆ/ دەبێت بە / و/ لە خواردندا، بەڵام هەمان دەنگ وەك خۆی بەبێ گۆڕان لە (شۆردن : شۆرا، دەشۆرێ)دا دەمێنێتەوە، شۆردن : شۆ ← دەشۆم ←دەشۆرێ))[1]، کەچی لە دیالێکتی ناوەڕاست لە شێوەزاری هەولێر و شێوەزارەکانی تردا هەموویان دەڵێن (شورا، دەشورێ )، کەسمان نەبینیوە بڵێت ( شۆرا، دەشۆرێ )، بۆیە بڕیاردان لەسەر شتێك کارێکی سانا نییە، بەڵکو کارکردن و بەڵگەی زمانەوانی دەوێت، بۆیە دەبوایە لێکۆڵەر بە وردی بۆ ئەم حاڵەتە بچووبایە.

٣ـ ئەو کارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان بە دەنگی (ڕ) یان (ر) کۆتایی دێت، ئەوە بە سێ چەشن دەبینرێت[2]:ـ

أـ ئاخێوەری هەندێك ناوچە (د) دەخەنە نێوان ڕەگی ڕانەبوردوو و مۆرفێمی نادیاری (ـ ر) وەك:

---

(٢) فەرەیدوون عەبدول محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

(٣) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٢٧ـ٣٣٩.

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | مۆرفێمی زیادکراو | مۆرفێمی نادیار | مۆرفێمی ڕابوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|---|
| گێڕان | گێڕ | د | ر | ا | گێڕدرا |
| گۆڕان | گۆڕ | د | ر | ا | گۆڕدرا |

ب ـ لە هەندێك شێوەزاردا تەنیا یەك (ر) دەردەبڕێ و یەکێکیان تێدادەچێت، وەك:ـ

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | مۆرفێمی نادیار | مۆرفێمی ڕابوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|
| بڕین | بڕ | ر | ا | بڕا |
| گۆڕین | گۆڕ | ر | ا | گۆڕا |

ج ـ لە ئاخاوتنی گەلێك شێوەزاردا مۆرفێمی نادیاری (ر) بە ئاسانی بە دوای (ڕ) و (ر)ی کۆتایی ڕەگی کارەکەدا دەردەبڕێت، وەك:

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | مۆرفێمی نادیار | مۆرفێمی ڕابوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|
| بڕین | بڕ | ر | ا | بڕرا |
| گۆڕین | گۆڕ | ر | ا | گۆڕرا |

٤ـ کاری (گرتن ـــ girtin) کاتێك، کە دەکرێتە کاری ڕابوردووی بکەر نادیار، دەنگی (i) بزرۆکە دەگۆڕدرێت بە (ی)[1]، وەك:ـ

(١) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل ٢٧٥.

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|
| گرتن | گر | گیرا |

٥ ـ بوونی ڕەگی ڕابوردوو بە بناغە بۆ ساز کردنی کاری ڕابوردوو و ڕانەبوردووی بکەر نادیار، وەك:

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | ڕەگی ڕابوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|
| وتن(گوتن ) | لێ | وت / گوت | وترا، گوترا |
| ویستن | ەوێ | ویست | ویسترا.. [1] |

**قسەکەی بە ڕێبوار گوت.** ( بکەر دیار )

**قسەکە گوترا .** (بکەر نادیار ) [2]

٦ـ بوونی ڕەگی ڕانەبردوو و ڕابوردوو بە بناغە بۆ سازکردنی کاری ڕابوردووی بکەر نادیار، وەك:

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار | ڕەگی ڕابوردوو | کاری ڕابوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|
| هاویشتن | هاوێژ | هاوێژرا | هاویشت | هاویشترا |
| خواستن | خواز | خوازرا | خواست | خواسترا |
| خستن | خە | خرا | خست | خسترا.. [3] |

(٨٦) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٣٣.

(٨٧) نەریمان خۆشناو، چەمك و پێناسەی کارای نادیار، ل٥٥.

(٨٨) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل٣٣٣ـ٣٣٤.

لەوانەشە هەندێك حاڵەتی ناوێزەی تر هەبن، کە ئێمە درکمان پێنەکردبێت، بەلاّم ئەوەی پێویستە باسبکرێت، کە حاڵەتی ناوێزە هەیە لەخودی ئەو یاسایەی لە بارەی کاری ڕابوردووی بکەر نادیار دانراون .

هەروەها بۆ نەرێ کردنی کاری ڕابوردووی بکەر نادیار، ئەوە (نە) وەردەگیرێت و دەکەوێتە بەشی پێشەوەی کارەکە، وەك :

**کێڵرا ← نەکێڵرا**

**زەوییەکە کێڵرابوو .** (ئەرێی ڕابوردووی بکەر دیار)

**زەوییەکە نەکێڵرابوو.** ( نەرێی ڕابوردووی بکەر نادیار)

## کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار

پێناسەی ڕانەبوردوو هەر لە ناوەکەیەوە دیارە، کە ئەو کارەیە، ڕوودانەکەی دەکەوێتە دوای ئاخاوتن، واتا کارەکە ڕووی نەداوە، یان ئێستا ڕوودەدات یان لە داهاتوودا . لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕانەبوردوو، پەنا دەبرێتە بەر (ڕەگی ڕانەبوردوو) و، مۆرفێمی ئەرێی ڕانەبوردووش دەکەوێتە پێش ڕەگەکە و جێناوی لکاویش بە کارەکەوە دەنووسێت، واتا یاساکەی بەم شێوەیە :

**مۆرفێمی ئەرێ (دە) + ڕەگی ڕانەبوردوو + جێناوی لکاوی بێ هێز**[1]

**خواردن ← دە + خۆ + م = دەخۆم**

**شوشتن ← دە + شۆ + ات = دەشوات**

(١١٦) جێناوی بێ هێز ئەوانەن، کە لەگەڵ ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەردەکەون و بە دوای ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕدا دێن : بڕوانە: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، ل ١٠٦.

**شکان ← دە +شکێ + م = دەشکێم**

بـۆ جیاکردنـەوەی کـاری ڕانـەبوردووی (ئێسـتا و داهـاتوو) لـە دیـالێکتی ناوەڕاستدا، ئەوا بە هـۆی ئاوەڵکارە کاتییـەکان جـودا دەکرێنـەوە ((لـە کرمـانجیی خواروودا بۆ جیاکردنەوەی کاتی ئێستا و ئایندە هیچ نیشـانەیێکی وشەسـازی نییـە، جیاکردنـەوەیان بـە ڕێگـەی لێکسـیکی، واتـا بەیاریـدەی هەنـدێك وشـە بـە تایبـەتی ئاوەڵکردارەوە مەبەست دەردەبڕن))[1]، بە جۆرێك بۆ کاتی ئێستا (وا، ئەوا، ئێستا) بـەکاردێت و، بـۆ کـاتی داهـاتووش (بـەیانی، هەفتـەی داهـاتوو، مـانگێکی تـر، هەفتەیەکی .....هتد) بەکاردێت، وەکو:

وا
ئێستا } دەڕۆم بۆ کۆلێژ .
ئەوا
↓
کاری ڕانەبوردووی ئێستا

بەیانی
دواتر } دەڕۆم بۆ کۆلێژ .
هەفتەیەکی تر
.......
↓
کاری ڕانەبوردووی داهاتوو

---

(١) د ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ١٩٧.

بۆ نەرێکردنی کاری ڕانەبوردووش، ئەوا مۆرفێمی (نا) دەچێتە شوێنی (دە) و دەیکات بە نەرێ، وەك :

**دەڕۆم ⟵ ناڕۆم .**

**بەیانی دەچم بۆ بازاڕ .**

**بەیانی ناچم بۆ بازاڕ .**

ئەوەی پەیوەست بێت بە کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار، ئەوە ئەو کارانە دەگرێتەوە، کە ڕووینەداوە، یان ئێستا ڕوودەدات، یان دواتر ڕوودەدات لە لایەن کەسێکی نەناسراو و نادیارەوە .

یاسای سەرەکی سازکردنی کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار لە زمانی کوردی دیالێکتی ناوەڕاستدا، بە وەرگرتنی ڕەگی ڕانەبوردوو لەگەڵ مۆرفێمی نادیاری (ــ ر ) و مۆرفێمی (ــ ێ)ی ڕانەبوردوو سازدەبێت، بەم شێوەیە :ـ

دە + ڕەگی ڕانەبوردوو + مۆرفێمی نادیاری (ــ ر) + مۆرفێمی ڕانەبوردوو (ێ) وەك:

کێڵان ⟵ دە+کێڵ + ر+ێ = دەکێڵرێ

هێنان ⟵ دە + هێن + ر+ ێ = دەهێنرێ

خوێندن ⟵ دە + خوێن + ر +ێ = دەخوێنرێ

چنین ⟵ دە + چن + ر +ێ = دەچنرێ

**ئازاد زەوییەکە دەکێڵێ.** (کاری ڕانەبوردووی بکەر دیار)

**زەوییەکە دەکێڵرێ .** (کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار)

ئەگەرچی وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، کە سازکردنی کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار وەك یاسایەکی سەرەکی و بنچینەیی لە ڕەگی ڕانەبوردوو

وەردەگیرێت، بەڵام دەشێت حاڵەتی ناوێزەی تێدا بەدی بکرێت، لێرەدا هەندێك لەو حاڵەتانە دەخەینە ڕوو:

١- ئەو کارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان بە (ە) یا (ێ) کۆتایی دێت، کە دەکرێنە بکەر نادیار، ئەوە (ە) و (ێ)یان دەبن بە (إ ) بزرۆکە، یانیش تێدا دەچن[1]، وەك:-

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | دوا دەنگی ڕەگ | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|
| کردن | کە | ە | دەکرێ |
| بردن | بە | ە | دەبرێ |
| نان | نێ | ێ | دەنرێ[2] |

٢- ئەو کارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان بە (ۆ) کۆتایی هاتبێت، ئەوا دەبنە (و)[3]، وەك:-

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | دوا دەنگی ڕەگ | گۆڕانی دەنگ | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|
| خواردن | خۆ | ۆ | و | دەخورێ |
| شوشتن | شۆ | ۆ | و | دەشورێ |

٣- ئەو کارانەی ڕەگی ڕانەبوردوویان بە دەنگی (ڕ) یان (ر) کۆتایی دێت، ئەوە بە سێ چەشن دەبینرێت[4] :-

(١) د.زەرێ یوسوپۆڤا، شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسیەوە د. کوردستان موکریانی، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٥، ل١٦٢.

(٢) د.ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٣٤-٣٣٥.

(٣) د.ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٣٤.

(٤) هەمان سەرچاوە، ل ٣٣٩.

أ- ئاخێوەری هەندێك ناوچە (د) دەخەنە نێوان ڕەگی ڕانەبوردوو ومۆرفێمی نادیاری (ــ ر) وەك:

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | زیاد کراو | مۆرفێمی نادیار | مۆرفێمی ڕانەبردوو | ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|---|
| گێڕان | گێڕ | د | ر | ێ | دەگێڕدرێ |
| گۆڕان | گۆڕ | د | ر | ێ | دەگۆڕدرێ |

ب- لە هەندێك شێوەدا تەنیا یەك (ر) دەردەبڕێت و یەکێکیان تێدا دەچێت، وەك:

| چاوگ | مۆرفێی ئەرێی ڕانەبوردوو | ڕەگی ڕانەبردوو | مۆرفێمی نادیار | مۆرفێمی ڕانەبردوو | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|---|
| بڕین | دە | بڕ | ر | ێ | دەبڕێ |
| گۆڕین | دە | گۆڕ | ر | ێ | دەگۆڕێ |

ج- لە ئاخاوتنی گەلێك شێوەزاردا مۆرفێمی نادیاری (- ر) بە ئاسانی بە دوای (ڕ) و (ر)ی کۆتایی ڕەگی کارەکەدا دەردەبڕێت، وەك :-

| چاوگ | مۆرفێمی ئەرێی ڕانەبوردوو | ڕەگی ڕانەبوردوو | مۆرفێمی نادیار | مۆرفێمی ڕانەبردوو | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
|---|---|---|---|---|---|
| بڕین | دە | بڕ | ر | ێ | دەبڕرێ |
| گۆڕین | دە | گۆڕ | ر | ێ | دەگۆڕرێ |

١- کاری (گرتن ـ girtin) کاتێك کە دەکرێتە کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار، دەنگی (i) بزرۆکە دەگۆڕدرێت بە (ی) [1]، وەك:

(١) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل٢٧٥.

| چاوگ | نیشانە ئەرێی ڕانەبوردوو | ڕەگی ڕانەبوردوو | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
| --- | --- | --- | --- |
| گرتن | دە | گر | دەگیرێ |

٥- بوونی ڕەگی ڕابوردوو بە بناغە بۆ سازکردنی کاری ڕابوردوو و ڕانەبوردووی بکەر نادیار، وەك:

| چاوگ | مۆرفێمی ئەرێی ڕانەبوردوو | ڕەگی ڕانەبوردوو | ڕەگی ڕابوردوو | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| وتن (گوتن ) | دە | لێ | وت (گوت) | دەوترێ، دەگوترێ |
| ویستن | دە | ەوێ | ویست | دەویسترێ [1]. |

**ئازاد قسەکەی بە ڕێبوار گووت.** **( بکەر دیار )**

**قسەکە بە ڕێبوار دەگوترێ.** **( بکەر نادیار )**

٦- بوونی ڕەگی ڕانەبوردوو و ڕابوردوو بە بناغە بۆ ساز کردنی کاری ڕانەبوردووی بکەرنادیار، وەك:

| چاوگ | ڕەگی ڕانەبوردوو | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار | ڕەگی ڕابوردوو | کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| هاویشتن | هاوێژ | دەهاوێژرێ | هاویشت | دەهاویشترێ |
| خواستن | خواز | دەخوازرێ | خواست | دەخواسترێ |

(١٢٣) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٣٣.

خست خە دەخرێ خست دەخسترێ..[1]

لەوانەشە هەندێك حاڵەتی ناوێزەی تر هەبن، ئێمە درکمان پێ نەکردبێت، بەڵام ئەوەی پێویستە باسبکرێت، کە حاڵەتی ناوێزە هەیە لە خودی ئەو یاسایەی لە بارەی کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار دانراوە.

هەروەها بۆ نەرێکردنی کاری ڕانەبوردووی بکەر نادیار، ئەوە(نا) وەردەگرێت و دەچێتە شوێنی (دە)ی ئەرێی ڕانەبوردوو، وەك:

**دەکێڵرێ ← ناکێڵرێ**

**- زەوییەکە دەکێڵرێ. (ئەرێی ڕانەبوردووی بکەر دیار)**

**- زەوییەکە ناکێڵرێ. (نەرێی ڕانەبوردووی بکەر نادیار)**

## مۆرفێمی بکەر نادیار

لە زمانی کوردی (دیالێکتی ناوەڕاست)دا، هەندێك لە نووسەران دەمێکە توانیویانە دەست نیشانی مۆرفێمی بکەر نادیار بکەن [2]، کە ئەویش مۆرفێمی (ـ ر)یە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە نووسەران ئاوێزانییەکی گەورەیان کردبوو لە نێوان مۆرفێمی بکەر نادیار و مۆرفێمی کات، کەوا زیاتر مەبەستمان مۆرفێمی (ا) بۆ

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٣-٣٣٤.

(٢) ئەو نووسەرانەی کە مۆرفێمی (ـ ر)یان بە مۆرفێمی بکەر نادیار داناوە، پێکهاتوون لە (( د. زەرێ یوسوپۆڤا، مەکارس، د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وریا عومەر ئەمین، فەرەیدوون عەبدول مەحموود، نەریمان خۆشناو،.... هتد)).

ڕابوردوو و مۆرفێمی(ـ ێ)یە بۆ ڕانەبوردوو، کەچی نووسەران (ـ را) یان بە یەکەوە بۆ ڕابوردووی نادیار بەکارهێناوە و(ـــ رێ)یان بۆ ڕانەبوردووی نادیار بەکارهێناوە.

سەبارەت بە شوێنی مۆرفێمی بکەر نادیار لەناو کارەکەشدا، ئەوە شوێنێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە ئەویش دەکەوێتە دوای (ڕەگی کار) و پێش مۆرفێمی کاتی کارەکە، واتا ناوەڕاستی کارەکە لەخۆ دەگرێت، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، با سەیری ئەم دوو ڕستەیە بکەین:

نامەکە نووسرا.




نامەکە دەنووسرێ.



## کاری تێپەڕ

لە زمانی کوردیدا زمانەوانان و نووسەران چەندین پێناسەیان بۆ کاری تێپەڕ کردوو[1]، دەتوانین هەموو پێناسەکانیش لە چوار دەوری یەك چەمکدا کۆ بکەینەوە، بەو واتایەی بڵێین کاری تێپەڕ ئەو کارەیە، کە کاریگەریی هێزەکەی لە بکەرەوە تێدەپەڕێت بۆ سەر کەرەستەیەکی تر، ئەویش بەرکاری ڕاستەوخۆیە، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە با سەیری ئەم نموونەیە بکەین :

- گۆران سێوەکەی خوارد .

گۆران ← بکەر

سێوەکەی ← بەرکاری ڕاستەوخۆ

خوارد ← کاری ڕابوردووی تێپەڕ

لەم ڕستە یەدا وشەی (گۆران) بکەری ناو ڕستەکەیە و، بە خواردنی شتێك هەستاوە، کە ئەویش (سێو)ە، هێزەکەش لێرەدا کەوتۆتە سەر بەرکاری ڕاستەوخۆ، کارەکەش کە (خوارد)ە، کارێکی تێپەڕە. دەبێت ئەوەش بوترێت کە لە زمانی

---

(١) ـ سەعید صدقی دەڵێت : (( متعدی فعلیکە لە فاعلەکەی جوی ببیتەوە واحتیاجی ببی بە مفعول بە)) بڕوانە: مختصر صرف ونحوی کوردی، ١٩٢٨، ل٤٤ .

ـ تەوفیق وەهبی دەڵێت :((فیعلی موتەعەددی کاریێ بەیان ئەکا کەلە باسلێکراوەو تەجاوەزی کەسێ یان شتێکیتر بکا)) بڕوانە: دەستووری زمانی کوردی،١٩٢٩، ل ٤٢.

ـ نوری عەلی ئەمین دەڵێت : ((چاوگی تێپەڕ ئەو چاوگەیە هەر کاتێ فرمانێکی لێ دروست کرا، فرمانەکە لە (مسندالیە)یەکەی جوێ ئەبێتەوە بۆ کەسێ یا شتێکی تر)) بڕوانە : قواعدی زمانی کوردی لە صرف و نحودا، ١٩٦٠، ل٦١.

ـ د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف دەڵێت: ((واتای چالاکی کاراو ڕێچکەی بەرەوبەرکار نیشان دەدات)) بڕوانە: ڕێزمانی کوردی ـ بەرگی یەکەم (وشەسازی)) — بەشی پێنجەم —کردار ـ ٢٠٠٠، ل٤٦ .

کوردیدا هەموو کارێکی تێپەڕ لەناو ڕستەدا، یەك بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت، بەڵام بۆ بەرکاری ناڕاستەوخۆ، ئەوە دەشێت لە ڕستەی کاری تێپەڕدا بەرکارێکی ناڕاستەوخۆ یان زیاتر ببینرێت و، لەم وێنەیەی خوارەوەدا فراوانترین سنووری کاری تێپەڕ بەپێی کەرەستە سەرەکییەکان لەناو ڕستەدا دەخەینە ڕوو[1]:




لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جاران لە ڕستەی کاری تێپەڕدا، وا دەبێت بەرکارەکەی لە ڕووی سیما (ڕوخسار)ەوە بە دیار نەکەوێت، کە ئەمەش وای لە زۆر کەس کردووە بە هەڵەدا بچن و بڵێن ئەم ڕستەیە بەرکاری تێدا نییە، بەڵام لە ڕووی واتاوە بەرکارێك

(١) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل٤١.

لەناو ڕستەکەدا دەبینرێت، وەك ( ئازاد دەتوانێ بنووسێ)[1]، لێرەدا لە ڕووی ڕووخسارەوە بەرکار دەرنەکەوتووە، بەڵام لە ڕووی واتاوە ئازاد دەتوانێ شتێ بنووسێ، جا ئەم شتە نامەیە .. وتارە .. شیعرە.. یا هەر شتێکی ترە، دەبێتە بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە .

کاری تێپەڕ لە ڕووی هەبوونەوە، بە سەر دوو جۆر دابەش دەبێت :-

١- تێپەڕی ڕەسەن (بنجی)، ئەو کارە تێپەڕانە دەگرێتەوە، کە لە بناغە و بنجدا تێپەڕن، وەك ( برد، کرد، شوشت، خوارد،....).

٢- تێپەڕی ناڕەسەن (نابنجی)، ئەو کارە تێپەڕانە دەگرێتەوە، کە لە بناغەدا تێنەپەڕن، بەڵام بەهۆی پاشگری (اندن) بوونەتە کارێکی تێپەڕ،[2] وەك:

خەوتن ⟵ خەو + اندن = خەواندن .

هەروەها کاری تێپەڕ لە زمانی کوردیدا، هەروەك زمانی عەرەبی دەشێت یەك بەرکار وەرگرێ و، دەشێت زیاتر بێت، بەم شێوەیەی خوارەوە [3] :

یەکەم/ ئەو کارە تێپەڕانەی کە یەك بەرکار لەناو ڕستەدا وەردەگرن، وەك :

- مەریوان سێو دەخوات .

↓ ↓ ↓

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ

(١) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، کردار، ل ٣١٦ .

(٢) مصطفی محمد زەنگنە، کار و ئەرکی لە سینتاکسدا، ل٢٤.

(٣) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل ٤١ .

دووەم/ ئەو کارە تێپەڕانەی کە دوو بەرکار لە ڕستەدا وەردەگرن، وەك :

**من پارە دەدەمە تۆ.**

من: بکەر

پارە: بەرکاری ڕاستەوخۆ

دەدەم: کاری تێپەڕ

ە : پێشبەند

تۆ: بەرکاری ناڕاستەوخۆ

سێیەم/ ئەو کارە تێپەڕانەی، کە سێ بەرکار وەردەگرن، وەك کارەکانی (وەرگرتن، دان، بردن سەندن، کڕین )[1]، وەك :

**من پارە لە تۆ وەردەگرم بۆ ئازاد .**

من: بکەر

پارە: بەرکاری ڕاستەوخۆ

لە: پێشبەند

تۆ: بەرکاری ناڕاستەوخۆ

وەردەگرم: کاری تێپەڕ

بۆ:پێشبەند

ئازاد: بەرکاری ناڕاستەوخۆ

---

(١) نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو، کاری تیپەڕ لێکۆڵینەوەیەکی بەرانبەرییە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ . کاروان، ژ. (١٩٨)، ٢٠٠٥، ل ١٥٨ـ١٥٩.

لەمە زیاتر نامانەوێت لەسەر ئەم بابەتە بدوێین، چونکە ئەوەی زۆر گرنگە و گەرەکمانە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە، کە لە زمانی کوردیدا دەبێت کاری ناو ڕستەکە تێپەڕ بێت، ئینجا دەتوانین ڕستەی بکەر دیار بگۆڕین بۆ ڕستەی بکەر نادیار، بەڵام ئەگەر کارەکە تێنەپەڕ بوو، ئەوە دەبێت لە پێشدا کارەکە بگۆڕین بۆ تێپەڕ، وەك:ـ

شکا ← شکاندن

کامەران پەنجەرەکەی شکاند . ( بکەر دیار)




**پەنجەرەکە شکێنرا . ( بکەر نادیار)**

دیارە وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، کە ڕستەی بکەر نادیار لە کاری تێنەپەڕ سازناکرێت، بەڵکو دەبێت کارەکە تێپەڕ بێت، بۆیە لە زمانی کوردیدا ڕێگا چارە دانراوە بۆ گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ کاری تێپەڕ، ئەویش بە زیادکردنی پاشگری (ـ اندن) و خستنە سەر ڕەگی کارەکە، کە بە هۆیەوە دەیکاتە تێپەڕ، وەك:ـ

**خەوتن ← خەو + اندن = خەواندن**

**فڕین ← فڕ + اندن = فڕاندن**

**شکان ← شکا + اندن = شکاندن**

**ڕووخان ← ڕووخا + اندن = ڕووخاندن**

لەم کارانەی سەرەوەدا، کارەکانی (شکا، ڕووخا) بە (ا) کۆتاییان هاتووە، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە لە ڕەگی ڕابوردووەوە وەرگیراون بۆ کردنی بە تێپەڕ، دیارە لە نێوان ئەم دوو (ا)ە، یەکەکیان لەناو دەچێت، چونکە لە زمانی کوردیدا هەرگیز دوو بزوێن لە دوای یەکتردا نایێن.

هەروەها هەندێك کاری تێنەپەڕمان هەیە، کە بەرانبەرەکەیان کاری تێپەڕی هەیە، لەوانە(1):

| تێنەپەڕ | | تێپەڕ |
|---|---|---|
| کەوتن | ← | خستن |
| هاتن | ← | هێنان، هانین |
| چوون | ← | بردن |
| ڕۆیشتن | ← | ناردن |
| ڕژان | ← | ڕشتن |
| گۆڕان | ← | گۆڕین |
| سڕانەوە | ← | سڕینەوە |
| پچڕان | ← | پچڕین |
| بزووتن | ← | بزاوتن |
| سوان | ← | سوین (سوون) |

---

(١٤٧) لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

قەلشتن ← قەلاشتن

قلّیشان ← قەلاشتن

مانەوە ← هێشتنەوە، هێلانەوە

مان ← هێشتن، هێلان

کشانەوە ← کێشانەوە

هەڵستان ← هەڵ گرتن

هەروەها هەندێك كاری تێنەپەڕمان هەیە، دەشێت بەهۆی (ـاندن)ەوە بكرێنە تێپەڕ، سەرەڕای ئەوەش تێپەڕی بەرانبەریان هەیە، وەك :

| تێنەپەڕ | | تێپەڕ |
|---|---|---|
| كەوتن | ← | كەواندن، خستن |
| مردن | ← | مراندن، كوشتن |
| چوون | ← | چواندن، بردن |

لێرەدا لە زۆر حاڵەتدا مانای تێپەڕی بەرانبەر و بە تێپەڕ كراوەكە وەك یەك نابن، وەك (مردن) تێپەڕی بەرانبەری (كوشتن)ە و، دەكرێت بە (مراندن)، بەڵام لە ڕووی ماناوە (مراندن) و (كوشتن) جیاوازن[1]، وەك :

- **پیاوەكە خۆی كوشت — لێرەدا مردووە .**
- **پیاوەكە خۆی مراند ـ لێرەدا نەمردووە.**

هەروەها هەندێك كاری تێنەپەڕمان هەیە، كە بەرانبەریان كاری تێپەڕی نییە و پاشگری ( ـــ اندن)یش وەرناگرن، وەك[2]:

---

(١) وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل١٨٨.

(١٤٩) د. ئەوڕەحمان حاجی مارف، کردار، ل ٥٨.

( سرەوتن، نیشتن، زان، گەنین )

دیارە لێرەدا ئەم وشانە ڕوودانیان لە زوور ئارەزوو و دەسەلاتی مرۆڤدا نییە، چونکە ((تۆ دەتوانی یەکێکی تر( بخەوێنی و یا بشێوێنی) بەهۆی ئەو ئامرازانەوە، کە خەوتن و شێوان پەیدا دەکەن، بەلام ناتوانی لە دەروونی هەمان کەسدا (سرەوتن) پەیداکەیت، چونکە سرەوتنەکە لەلاوە نایەت بۆی ....)) [1]

هەروەها هەندێك کاری تێنەپەڕ، بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری (هێنان) و (خستن)ەوە دەکرێنە تێپەڕ، وەك:

**منداڵەکەی هێنایە پێکەنین .**

**منداڵەکەی خستە گریان .** [2]

ئەگەرچی لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد، کە پاشگری (اندن) کاری تێنەپەڕ دەکاتە تێپەڕ. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەوری ڕۆنانی کاری تێنەپەڕیش دەبینێت، بەتایبەتی کاتێك کە دەچێتە سەر ناوی دەنگە سروشتییەکان و دەیانکات بە کاری تێنەپەڕ، وەك :

قیژە + اندن = قیژاندن

گرمە + اندن = گرماندن

باعە + اندن = باعاندن

زیرە + اندن = زیڕاندن

باڕە + اندن = باڕاندن [3]

---

(١) لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی؛ ل١٢٣.

(٢) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل ٥٩.

(٣) لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

هەروەها (ـ اندن) چەندین ئەرکی تری جودا جودا دەبینێت، لەوانە چاوگی لێکدراو دەکات بە چاوگی داڕژاو، وەك :

نەخش کــردن ⟵ نەخشاندن [1]

هەروەها کار و چـاوگی بێگانـەی تێپـەڕ، بەتایبـەتی لـە زمـانی عـەرەبی دەکاتـە کوردی و هەر بە تێپەڕیش دەمێنێتەوە و، هەموو تایبەتمەندییـەکانی زمـانی کـوردی وەردەگرێت، وەك :

«شبە» + اندن = شوبهاندن

خلق + اندن = خولقاندن [2]

دیارە ئەم حاڵەتانەی، کە لـەوەوپێش ئاماژەمـان بـۆی کـرد، هـەموو وەك خـۆی سەد دەر سەد بەبێ گۆڕانکاری بـەکارنایێت، بـەڵکو حاڵـەتی تـریش هـەن و هەنـدێك گۆڕانکاریش دەبینرێت لە کاتی خستنە سەری پاشگری (ـ اندن) بۆ سـەر کارەکـان و، ئەرکی (ـ اندن) گـەلێك زۆرە، بـەڵام لێـرەدا هـەر ئەوەنـدە ئامـاژەی بـۆ دەکـەین، لەگەڵ ئەمانەشدا دەبێت ڕێکخستن و شێوازی پاشگری (ـ اندن) ڕوون بکەینەوە، کـە چۆن سازبووە، چونکە وەك زانراوە، کە پاشگری (ــ انـدن) هـەر هـەمووی مـۆرفێمی تێپەڕاندنی کار نییە، بەڵکو بە تەنیا (ن)ی یەکەم مۆرفێمی تێپەڕاندنە، هەروەك لەم نموونەیە ڕوونی دەکەینەوە[3] :

---

(١) د.نەسرین فەخری، پاشگری ( اندن ) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا،١٩٧٤، ل ٢٢٧ .

(٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٢٣.

(٣) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل٥٦ـ٥٧.




له دەمی ڕانەبوردوو (ان) دەبێتە (ێن)، واتا (ا) دەبێتە (ێ)، وەك :ـ

مراندن ← دەمرێنێت .

کەواتە دەبێت (ن)ەکە، مۆرفێمی تێپەڕاندن بێت، چونکە (ا) نیشانەی کاتە بۆ ڕابوردوو و،(ێ)ش نیشانەی کاتە بۆ ڕانەبوردوو[1].

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧.

## کاری تێنەپەڕ

لە زمانی کوردیدا نووسەران و زمانەوانان چەندین پێناسەیان بۆ کاری تێنەپەڕ کردووە[1]، دەتوانین هەموو پێناسەکان لە چواردەوری یەك چەمکدا کۆبکەینەوە، بەو واتایەی بلێین کاری تێنەپەڕ ئەو کارەیە، کە کاریگەری هێزەکەی لە بکەرەوە تێ ناپەڕێت بۆ سەر بەشێکی تر، بەو واتایەی ناچێتە سەر بەرکاری ڕاستەوخۆ، واتە خاڵی جیاکردنەوەی تێنەپەڕ لە تێپەڕ، بەرکاری ڕاستەوخۆیە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، با سەیری ئەم نموونەیە بکەین :

- ڕزگار ڕۆیشت .

↓ ↓

بکەر کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ

لەم ڕستەیەدا وشەی (ڕزگار) بکەری ناو ڕستەکەیە و، کارێکی ئەنجام داوە، ئەویش (ڕۆیشتن)ە و، هێزەکەی لەناو ڕستەدا تەنیا لە دەوری بکەر جێگیر بووە و نەچۆتە سەر کەرەستەیەکی تر و، کاری (ڕۆیشت)یش کارێکی ڕابوردووی تێنەپەڕە،

---

(١)بڕوانە: ـ سەعید صدقی دەڵێت: ((لازم فعلیکە دەبی لازم فاعلەکەی لیجوی نەبیتەوە و محتاج بە مفعول بە نەبی وکو حسن هات )) بڕوانە: مختصر صرف ونحوی کوردی، ١٩٢٨، ل ٤٤ .

ـ تەوفیق وەهبی دەڵێت: (( فیعلی لازیم کاریێ یان حالێ بەیان ئەکا کە لە باسلێکراوەوە ڕاستەوخۆ تەجاوەزی کەسێ یان شتێکیتر نەکا، وەکو قەل ئەفڕێ )) بڕوانە : دەستووری زمانی کوردی، ١٩٢٩، ل ٤٢ .

ـ نوری عەلی ئەمین دەڵێت: (( چاوگی تێنەپەڕ ئەو چاوگەیە هەر کاتێ فرمانێکی لێ دروست کرا لە (مسندالیە)یەکەی جوێ نەبیتەوە بۆ کەسێ یان شتێکی تر، وەکو دۆیەکە ڕژا )) بڕوانە : قواعدی زمانی کوردی لە صرف و نحودا، ١٩٦٠،ل٦٠.

ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێت: (( کرداری تێنەپەڕ پێوەندیی ڕوودان بە کاراوە ڕادەگەیەنن، وە ئەم جۆرە کردارانە پێویستیان بە بەرکار نی یە)) بڕوانە: ڕێزمانی کوردی، کردار،٢٠٠٠، ل ٤٦ .

ئەم ڕستەیەی سەرەوەش بە تەسکترین ڕستەی کاری تێنەپەڕ دەژمێردرێت، کە تەنیا (بکەر)ی لەناو ڕستەدا وەرگرتووە، بەڵام دەشێت لە شوێنی تردا کاری تێنەپەڕ، جگە لە(بکەر) لەگەڵ چەندین کەرەستەی تردا دەرکەوێت، لەوانە (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)، هەروەکو لەم وێنەیەی خوارەوەدا ڕستەیەکی فراوانی سنووری کاری تێنەپەڕ لەناو ڕستەدا دەخەینە ڕوو[1] :ـ




(١) عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوە، ل٤٣ .

لە زمانی کوردیدا کاری تێنەپەڕ لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە[1]:

١ـ تێنەپەڕی خوازەکی: لەم جۆرە کارانەدا دەوری (بکەر) شتێکی ئاشکرا و ئیرادییە، وەك :ـ

**ئازاد هات .**

**کوڕەکە ڕۆیشت.**

لێرەدا کارە تێنەپەڕەکانی (هات، ڕۆیشت )،پێویستییان بە بکەری ڕاستەقینەی ناو ڕستەکە هەیە بۆ هەڵسوڕانی کارەکە ...

٢ـ تێنەپەڕی ڕوودان: لەم جۆرەدا، بکەر دەورێکی تایبەتی خۆی نییە، بەو واتایەی کە ئیشەکە بەبێ ویستی بکەر دێتە دی، وەك :ـ

**ئاوەکە ڕژا .**

**شوشەکە شکا .**

لەم ڕستانەدا کارە تێنەپەڕەکانی (ڕژا، شکا) پێویستییان بە دەرکەوتنی بکەرەکە نییە و، هەروەها ڕۆڵی بکەر بە دەرناکەوێت، بەو واتایەی ( ئاوەکە، شوشەکە) تەنیا لە ڕووی ڕێزمانەوە بکەرن.

دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە لە زمانی کوردیدا ناشێت کارێکی تێپەڕ بۆ کاری تێنەپەڕ بگۆڕدرێت، واتا کارە تێنەپەڕەکان تەنیا ئەو کارانە دەگەڕێتەوە، کە لە بنجدا تێنەپەڕن .

(١) د.ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٥٠.

## بکەر نادیار لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا یاساکانی سازکردنی بکەر نادیار جیاوازە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١ـ بکەر و ئەوەی پەیوەندی بە بکەرەوە هەیە لای دەبەین.

٢ـ بەرکاری ڕاستەوخۆ دێتە شوێنی بکەر و هەر بە بەرکاری ڕاستەوخۆ دەمێنێتەوە.

٣ـ چاوگی کار وەردەگرین.

٤ـ کاری یاریدەدەری (هاتن) بۆ دەمەکانی :

* بۆ کاری ڕابردوو (هاتە) بەکاردێت، بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| أـ بۆ ڕابردووی نزیک | هاتە + چاوگ |
| ب ـ بۆ ڕابردووی بەردەوام | دهاتە + چاوگ |
| جـ ـ بۆ ڕابردووی تەواو | هاتیە + چاوگ |
| د ـ بۆ ڕابردووی دوور | هاتبوو + چاوگ |

*بۆ کاری ڕانەبردوو، بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| أ ـ بۆ کاتی ئێستا | دهێتە + چاوگ |
| ب ـ بۆ کاتی داهاتوو | دێ هێتە + چاوگ |

**ـ ئازادی سێڤ خار.**

| | |
|---|---|
| سێڤ هاتە خارن. | ڕابردووی نزیک |
| سێڤ دهاتە خارن. | ڕابردووی بەردەوام |
| سێڤ هاتیە خارن. | ڕابردووی تەواو |
| سێڤ هاتبوو خارن. | ڕابردووی دوور |

سێڤ دهێته خـارن. رانەبردووی ئێستـا

سێڤ دێ هێته خارن. رانەبردووی داهاتوو

**- وی چـا گەرمـکر.**

چـا هاته گەرمکرن. ڕابردووی نزیك

چـا دهاته گەرمکرن. ڕابردووی بەردەوام

چـا هاتیه گەرمکرن. ڕابردووی تەواو

چـا هاتبوو گەرمکرن. ڕابردووی دوور

چـا دهـێته گەرمکرن. رانەبردووی ئێستـا

چـا دێ هێته گەرمکرن. رانەبردووی داهاتوو

**- نەسـرینێ نامـە نڤسی.**

نـامـە هاته نڤسین. ڕابردووی نزیك

نـامـە دهاته نڤسین. ڕابردووی بەردەوام

نـامـە هاتیه نڤسین. ڕابردووی تەواو

نـامـە هاتبوو نڤسین. ڕابردووی دوور

نـامـە دهێتــە نڤسین. رانەبردووی ئێسـتا

نـامـە دێ هێته نڤسین. رانەبردووی داهاتوو

*بـۆ حالـەتی کـۆ دەستورەکان بەم شێوەیە دەبێت:

١- ڕابردووی نزیك هــاتنە + چـاوگ

٢- ڕابردووی دوور هاتبوونە + چـاوگ

| | |
|---|---|
| ٣- ڕابردووی تـەواو | هـاتینە + چاوگ |
| ٤- ڕابردووی بەردەوام | دهـاتنە + چاوگ |
| ٥- ڕانەبردووی ئێستا | دهـێنە + چاوگ |
| ٦- ڕانەبردووی داهاتوو | دێ هێنە + چاوگ |

**- وان کوڕان زەڤیێن خۆ کێلاّن.**

| | |
|---|---|
| زەڤی هاتنە کـێلاّن. | ڕابردووی نزیك |
| زەڤی هاتبوونە کێلاّن. | ڕابردووی دوور |
| زەڤی هاتینە کـێلاّن. | ڕابردووی تەواو |
| زەڤی دهاتنە کـێلاّن. | ڕابردووی بەردەوام |
| زەڤی دهـێنە کێلاّن. | ڕانەبردووی ئێستا |
| زەڤی دێ هێنە کێلاّن. | ڕانەبردووی داهاتوو |

**- ئازادی سێڤ خـارن.**

| | |
|---|---|
| سێڤ هاتنە خـارن. | ڕابردووی نزیك |
| سێڤ هاتبوونە خارن. | ڕابردووی دوور |
| سێڤ هاتینە خـارن. | ڕابردووی تەواو |
| سێڤ دهاتنە خـارن. | ڕابردووی بەردەوام |
| سێڤ دهـێنە خارن. | ڕانەبردووی ئێستا |
| سێڤ دێ هێنە خارن. | ڕانەبردووی داهاتوو |

**٥ـ بکەرنادیاری ئاماژە پێکراو**

وەکو دەزانرێت، کە ڕستەی بکەر نادیار، ئەوەیە کە بکەرەکەی لەناو ڕستەدا دەرنەکەوێت، کەچی (( لە زمانی کوردیدا حاڵەتی ئەوتۆ بەرچاو دەکەوێ، کە بە ڕێگەی وەسفی ڕستەسازیدا پەنجە بۆ کارا ڕابکێشرێ ))[1]، واتە لە شوێنێکی تری ناو ڕستەکە هەست بە بوونی (بکەر ـ فاعل ) دەکرێت و، لێرەدا هەندێك لەو یاسایانە دەخەینە ڕوو :

١- بە هۆی پێشبەندی (بە، لە، بۆ، پێ،.......)، وەك :

**ـ شاخەکە بە بەفر داپۆشراوە[2].**

**ـ باج لە دەوڵەمەند دەستێنرێ[3].**

**ـ ئیشم بۆ ناکرێ[4].**

**ـ نانم پێ ناخورێ.**

٢- بە هۆی دەستەواژەی ( بەدەستی)یەوە، وەك[5]:ـ

**ـ کراسەکە بە دەستی ڕێناز شوشتراوە .**

**ـ پێنووسەکە بە دەستی ئاریان شکێنراوە .**

٣- بەهۆی دەستەواژەکانی (لەلایەن .......وە)، (لەڕێگەی.....وە)، (بەهۆی ... وە)، (لەڕێی .....وە) .. هتد[6]، وەك:

---

(١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٤١ .

(٢) فەرەیدوون عەبدول محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل ٩٠ .

(٣) د.ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٤٢ .

(٤) فەرەیدوون عەبدول محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل ٨٩ .

(٥) هەمان سەرچاوە، ل ٩٠.

(٦) د. ئەورەحمانی حاجی مارف، کردار، ل ٣٤١ .

- **شاسوار لەلایەن هەڵکەوتەوە کوژراوە.**
- **هاوناز لەڕێگەی بەنازەوە هێنراوە .**
- **نازەنین بەهۆی کارەباوە کوژراوە .**
- **سۆزان لەڕێی بەسۆزەوە نێردراوە .**

هەندێك لە نووسەران بەم جۆرە ڕستانە دەڵێن ( نادیاری درێژ )، کە بکەرەکەی لە شێوەی سەربار دا دەرکەوتووە (( ئەو ڕستە نادیارانەی کە بکەر، یان کارایان تێدایە و لە ڕستەکەدا لە شێوەی سەربار دا دەرکەوتوتەوە (نادیاری درێژ)))[1]، دیارە گومان لەوەدا نییە، کە بکەرەکانی ئەم ڕستانە لە فۆرمدا نادیارن، بەڵام (بکەر) لە شوێنێکی تری ڕستەکەدا دەرکەوتووە، بۆیە بەم ڕستانە دەوترێت ڕستەی بکەر نادیاری ئامارە پێکراوە .

کەواتە لەمجۆرەدا کاری ڕستەکە لەسەر شێوەی نادیارییە و، بەرکاری ڕاستەوخۆ لە سەرەتا و لە شوێنی بکەر هاتووە و، بکەریش لە شوێنێکی تری ڕستەکە هاتووە .

---

(١) فەرەیدوون عەبدول محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل ٨٨ .

# بـــەرکـــار

## چەمکی بەرکار

لـە زمـانی کوردیـدا جگـە لـە زاراوەی بـەرکار، ئـەوە زاراوەی تەواوکـەریش بەکاردەهێنرێت، بـەلأم ئـەوەی ڕاسـتی بێـت زاراوەی بـەرکار زانسـتی تـرە لـە چـاو زاراوەی تـەواوکەر.

## پێناسەی بـــەرکار

بـەو وشـانە(نـاو یان جێنـاو) دەوتـرێت، کـە بـەر کـاریـگەریی کـار دەکـەون، ئەویش بە دوو شێوە، شێوەیەکیان ڕاستەوخۆیە و شێوەکەی تریان ناڕاستەوخۆ.

## یەکەم / بەرکاری ڕاستەوخۆ :

بـەو وشـــانە دەوتـرێ کـــە ڕاسـتەوخۆ دەکەونـە ژێـر کاریگـەریی کـاری ڕستەکـــەوە و مـەرجی سـەرەکی لـە پەیـدابوونی بـەرکاری ڕاسـتەوخۆ لـە ڕسـتەدا پەیوەستە بە کاری تێپەڕەوە.

بەگوێرەی یاسا لە زمـانی کوردیـدا دەبێـت هـەموو کـارێکی تێپـەڕ یـاخود هەموو ڕسـتەیەك دەبێـت یـەك بـەرکاری ڕاسـتەوخۆی تێـدا بێـت، بـەلأم لـەهەندێ حاڵەتـی زۆر دەگمەنـــــدا دوو بـەرکـاری ڕاستەوخۆ دەردەکـەوێت(بەلأم لـە زمـانی عەرەبیدا ئاســـاییە دوو بـەرکـاری ڕاستەوخۆ یـان سـێ بـەرکاری ڕاسـتەوخۆ لـــە ڕستەدا دەربـــکەوێت ). وەکـو لـەپێشەوە ئاماژەمان بـۆی کـرد کـە بەرکـاری ڕاستەوخۆ پـەیوەستە بـە کـاری تێپـەڕەوە، هـەر بۆیەشـە کـارە تێپـەڕەکان بڕیـار لەسەر چەندێتی دەرکـەوتنـی بەرکـــاری ڕاســتەوخۆ و بـەرکـاری نـاڕاســتەوخۆ دەدەن، چـونکە دەشـێ بـەرکـــاری ڕاستەوخۆ و بەرکـاری ناڕاستەوخۆ لـەڕستەدا بەیەکەوە بـێن، **بۆیـە لێرەدا ئەم پۆلێنکـــردنە دەکەین بەهۆی کاری تـێپەڕ :**

یەکەم / ئەو کارە تێپەڕانەی کە یەك بەرکار لە ناو ڕستەدا وەردەگرن، وەك :

- مەریوان سێو دەخوات

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

- بەناز نانی خوارد.

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

- شیلان کراسێکی کڕی.

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

دووەم / ئەو کارە تێپەڕانەی کە دوو بەرکار لە ڕستەدا وەردەگرن، وەك:

- من پارە دەدەمە تۆ .

- سۆزان بە کەوچك نان دەخوات.

بکەر پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ ب.ڕاستەوخۆ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ

سێیەم / دەشێ لەهەندێ حاڵەتی دەگمەندا کاری تێپەڕ زیاتر لە بەرکارێکی ڕاستەوخۆ وەردەگرێت، وەك :

- مامۆستاکە ڕێزمانی کوردی فێرکردین .

بکەر

بەرکاری ڕاستەوخۆ(٢)

بەرکاری ڕاستەوخۆ(١)

چوارەم / هەندێ جار کاری تێپەڕ لەڕستەدا چەندین بەرکار وەردەگرێ، وەك :

**ـ ئازاد شـــەوێ لـــەماڵـــەوە پـــارە لـــە باوکـم وەردەگـرێ بـــۆ شـێرزاد.**

بەرکاری ڕاستەوخۆ لەهەندێ حاڵەتدا لەڕووی ڕووخسارەوە دەرناکەوێت، بەڵام لـــەڕووی ناوەڕۆکەوە بوونی هەیە، وەك :

**ڕزگار خواردی .**

**بەناز دەتوانێ بنووسێ.**

**ئەحمەد کوشتی.**

لـــەم ڕســـتانەی ســـەرەوەدا وشـــەکانی (ڕزگـار، بـەناز، ئەحمـەد) بکـەری ڕستەکانن، وشەکانی (خواردی، بنووسێ، کوشتی) کاری تێپەڕی ڕستەکانن. لێرەدا لەڕووی ڕووخسارەوە بەرکاری ڕاستەوخۆ دەرنەکەوتووە، بەلام لـەڕووی نـاوەرۆك و ڕۆنانـی ژێرەوەدا بـەرکاری ڕاستەوخۆ بوونی هەیـە، چـونکە لـە ڕسـتەی یەکەمـدا (ڕزگار) شتێکی خـواردووە، جا ئەم شـتە چـایەیە، قاوەیـە، یـان هـەر شـتێك بێـت، ئەوە دەبێتە بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەکە. لە ڕستەی دووەمـدا (بـەناز) شـتێکی نوسیوە، ئینجـا ئـەم شـتە شـیعرە، چیرۆکە، یـان هـەر شـتێك بێـت، ئـەوە دەبێتـە بـەرکاری ڕاسـتەوخۆی ڕسـتەکە. لەڕسـتەی سـێیەمدا بەهـەمان شـێوە (ئەحمـەد) کەسێکی کوشتووە، ئەم کەسەش دەبێتە بەرکاری ڕاستەوخۆ.

تـێبینـی/

لە هەنـدێ حاڵەتـدا کـاری تێنەپـەڕ بـەبێ (انـدن ) لـە سـنوری ڕسـتەدا دەبێتـە کـارێکی تێـــپەڕ، لەم حاڵەشـدا کـارە تێپەڕەکـە دەبێتـە کـارێکی تێپـەڕی نـابنجی، چونکە وەکو دەزانین لە زمانـی کوردیدا دوو جۆر کـاری تێپـەڕمان هەیـە، یـەکێکیان

پێیدەوترێت (بنجی) کە لە بنەڕەتدا کارێکی تێپەڕە، ئەویتریشیان پێیدەوترێت (نابنجی)، کە لە بنەڕەتدا کارێکی تێنەپەڕە، ئەوەی لەم حاڵەتەدا مەبەستمانە ئەوەیە، کە بەبێ (اندن) کارەکە بۆتە تێپەڕ و بەرکاری ڕاستەوخۆشی وەرگرتووە، وەك:

| بکەر | بەرکاری ڕاستەخۆ | بۆ بکەر دەگەڕێتەوە | کاری ڕابردووی تێپەڕی نابنجی |
|---|---|---|---|
| من | ماڵەکە | م | سوتا |
| تۆ | ماڵەکە | ت | سوتا |
| ئەو | ماڵەکە | ی | سوتا |
| ئێمە | ماڵەکە | مان | سوتا |
| ئێوە | ماڵەکە | تان | سوتا |
| ئەوان | ماڵەکە | یان | سوتا |

## دووەم/ بەرکاری ناڕاستەوخۆ

بەو وشانە دەوترێ کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەکەونە ژێر کاریگەریی کارەوە، مەرجی دەرکەوتنی بەرکاری ناڕاستەوخۆش لە ڕستەدا پەیوەستە بە پێشبەندەکانەوە.دیارە ئەم دیاردەیەش وەنەبێت تەنها لە زمانی کوردیدا بوونی

هەبێت، بەڵکو لە زمانی عەرەبیشدا دەبینرێت، ئەویش پێیدەوترێت (حرف جر، اسم مجرور).

- نازەنین چوو بۆ زانکۆ.
بکەر ڕانەبردووی تێنەپەڕ پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ

- فڕۆکەکە بە ئاسماندا دەسوڕێتەوە.
بکەر پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ

- نازدار بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشت.
بکەر پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ کاری ڕابردووی تێنەپەڕ

- ئەحمەد بە چەقۆ شەڕدەکات.
بکەر پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ کاری ڕابردووی تێپەڕ

کارزان بە پێنووس دەنووسێت.
بکەر پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ

- شیلان بە کەوچك نان دەخوات.
بکەر پێشبەند ب.ناڕاستەوخۆ ب.ڕاستەوخۆ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ

**چەند تێبینیەك /**

**یەکەم/** ژمارە و ئاوەڵناو کاتێك لەدوای پێشبەندەوە دێت، ئەوە ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆ نابینێت، بەڵکو لە شوێنێکی تری ڕستەکە بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەردەکەوێت، وەك:

- بەناز لە یەکەمین ژوور دانیشتووە.
بکەر پێشبەند ژمارەی ڕێکخستن ب.ناراستەوخۆ کاری ڕانەبردووی تێنەپەڕ

- شیلان لە جوانترین ژوور دانیشتووە.

بکەر پێشبەند ئاوەڵناوی چۆنیەتی ب.ناڕاستەوخۆ کاری ڕابردووی تێنەپەڕ

**دووەم /** لە هەندێ حاڵەتی بکەر نادیاری ئامازەپێکراودا، لەدوای پێشبەندەکە، بەرکاری ناڕاستەوخۆ نایێت، وەك:

| | | | |
|---|---|---|---|
| - شاخەکە | بە | بەفر | داپۆشراوە. |
| بەرکاری ڕاستەوخۆ | پێشبەند | بکەر نادیاری ئامازەپێکراو | کاری ڕابردووی بکەر نادیار |

**سێیەم /** دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کە لەناو ڕستەدا هەندێك جار پێشبەندەکان شێوەی خۆیان دەگۆڕن، بەو واتایەی لەشێوەی سەربەخۆوە دەگۆڕدرێن بۆ شێوەی لکاو.نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| بە من دەشکێ. | بە تۆ دەڵێم . | لە تۆ دەپرسم . |
| پێم دەشکێ | پێت دەڵێم . | لێت دەپرسم . |

| | | |
|---|---|---|
| بە ← پێ | بە ← پێ | لە ← لێ |
| من ← م | تۆ ← ت | تۆ ← ت |

**چوارەم /** لابردنی بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە ڕستەدا:
بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ دوو کەرەسەی سەرەکی ڕستەن، بەو واتایەی دەبێت لە ڕستەدا بوونیان هەبێت، بەجۆرێك بکەر لەهەردوو کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی کاری تەواودا دەردەکەوێت، بەڵام بەرکاری ڕاستەوخۆ تەنیا لەکاری تێپەڕدا دەردەکەوێت.

ئەم دوو کەرەسەیە هەندێك جار دەشێ لە ڕۆنانی سەرەوەدا دەرنەکەون یاخود لابـبرێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەناوەڕۆکی ڕستەکەدا بوونیان هەیە، بەتایبەتی لەدابەشکردنی نەخشەی فرێزدا، نموونە:

ئازاد هات. ⟵ هات.

کامەران وانەکەی خوێند ⟵ خوێندی.

لە ڕستەی یەکەمدا (ئازاد هات) توانیمان لەڕوی ڕوخسارەوە بکەری ڕستەکە لابەرین و سادەترین جۆری ڕستەی لێ دروست بکەین، کە ئەویش بۆتە (هات)، کەچی لەناوەڕۆکەوە خودی وشەی (هات) واتای بکەریشی تێدایە.بەم شێوەیە:

هات.

ڕەگی کار ← هێ
کات ← ت
بکەر ← Ø

لە ڕستەی دووەمیشدا توانیمان بکەر و بەرکار لەڕستەکە لابەرین، ئەگەرچی بکەرەکە لەشێوەی جێناوی لکاودا دەرکەوتۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەناوەڕۆکی ڕستەکەدا کەرەسە سەرەکییەکان بوونیان هەیە، چونکە لەم ڕستەیەدا کاری ڕستەکە کارێکی تێپەڕە، کە پێویستی بە بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ هەیە، بەم شێوەیە:

خوێندی.

ڕەگی کار ← خوێن
کات ← د
بکەر ← ی
بەرکاری ڕاستەوخۆ ← Ø

دەربارەی پێشبەند و بەرکاری ناڕاستەوخۆش، دەشێ لەزۆربەی حاڵەتەکاندا لایان بەرین، بەبێ ئەوەی واتای سەرەکی ڕستەکە تێکبدات، لەهەمان کاتیشدا هیچ مۆرفیمێك بۆ بەرکارە ناڕاستەوخۆکە لەکاری ڕستەکە وەرناگرێت، بەو واتایەی کارەکانی نێو ڕستەکە تەنیا هێما بۆ بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ دەکەن، وەکو:

ئازاد بە ئوتومبێل ڕۆیشت. ←———— ڕۆیشت. یان ئازاد ڕۆیشت.

لەم ڕستەیەدا( بە ئوتومبێل ) پێشبەند و بەرکاری ناڕاستەوخۆی، ڕستەکەن، توانراوە لە ڕستەکە لایانبەرین، بەبێ ئەوەی کاری ( ڕۆیشت ) هیچ هێمایەك بۆ بەرکارە ناڕاستەوخۆکە بکات. هەر وەکو لەخوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:




بەڵام لە هەندێ حاڵەتی زۆر دەگمەندا بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەمێنێتەوە، کاتێ لە کاری ناتەواودا دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو و لەگەڵ کارە ناتەواوەکەش ئەرکی گوزارە دەبینێ. وەك:

**ـ ئازاد دەبێت بە ئەندازیار .**

ئازاد : نیهاد

دەبێت : کاری ناتەواو بۆ کاتی داهاتوو

بە : پێشبەند

ئەندازیار : بەرکاری ناڕاستەخۆ و تەواوکەری کاری ناتەواو

ئەندازیار دەبێت : گوزارە

| نیـــــهاد | بــکەری ڕێزمانی |
|---|---|
| ١ـ ڕستەکە دەبێت کاری ناتەواوی تێدابێت.<br>٢ـ هیچ کارێك ئەنجام نادات.<br>٣ـ بەشێوەیەکی ئاسایی لە سەرەتای ڕستەدا دێت.<br>ـ شەماڵ مامۆستایـــــــە. | ١ـ ڕستەکە دەبێت کاری تەواوی تێدابێت.<br>٢ـ هیچ کارێك ئەنجام نادات.<br>٣ـ ـ بەشێوەیەکی ئاسایی لە سەرەتای ڕستەدا دێت.<br>ـ پەنجـــــەرەکە شـــکا. |

| کــاری تــەواو | کــاری ناتــەواو |
| --- | --- |
| ١ــ کـاره تــەواوەکان کـات و ڕوودانیان تێدایە.<br>٢ـ لەڕووی هێزەوە تێپەڕ یان تێنەپەڕن.<br>٣ــ کـاره تــەواوەکان کۆمەڵەیەکی کراوە پێکدێنن، بەو واتایەی وشەی نوێ وەردەگرن، هەر بۆیە ژمارەی کـاره تـەواوەکان زۆره و لە زیادبووندایە.<br>٤ـ هەر کاتێك کاری تەواو لە ڕستەدا هەبێت، ئەوە بکەر یاخود بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا پەیدا دەبێت.<br>٥ـ کاری تەواو لە ڕستەدا بە تەنیا بەکاردێت و واتای تەواو دەبەخشێت، لەم حاڵەتەشدا تەنیا کارەکە دەتوانێت ڕستەیەکی سادە لەجۆری | ١ـ کاره ناتەواوەکان تەنیا کاتیان تێدایە.<br>٢ـ لەڕووی هێزەوە تەنیا تێنەپەڕن.<br>٣ـ کاره ناتەواوەکان کۆمەڵەیەکی داخراو پێکدێنن، بەو واتایەی وشەی نوێ وەرناگرن، هەر بۆیەشە ژمارەیان دیاریکراوە.<br>٤ـ هەر کاتێك کاری ناتەواو لەڕستەدا هەبێت، ئەوە نیهاد و گوزارە لە ڕستەکەدا پەیدا دەبێت.<br>٥ـ کاره ناتەواوەکان بەتەنیا ناتوانن لە ڕستەدا بەکاربهێنرێن، بەڵکو دەبێت هەمیشە وشەیەکیان لەگەڵدابێ، ئەم وشەیەش ئەرکی تەواوکەری دەگەیەنێ، واتا کاره ناتەواوەکە دەشێ لەگەڵ وشەیەکی تردا بێ و ڕستەیەکی سادە پێکبێنێت. وەك:<br>جوانە . باشە . |

# فــــرێـــــز

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی فرێز، ئەوە زاراوەکانی (گرێ، دەستەواژە، کورتیلە ڕستە ...) بەکاردەهێنرێت، کە هەر هەموویان هەمان واتا دەگەیەنن.

دەربارەی پێناسەی فرێز کۆمەڵێ ڕاوبۆچوونی جیاواز هەیە، کە هەندێکیان دەچێتە حاڵەتی کۆنە لەبارەی فرێزەوە، و هەندێکی تر بۆچوونی نوێیە لەبارەی فرێز، لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێ لەو بۆچوونانە بخەینە ڕوو:

لە کتێبی مەنهەجی قوتابخانەکان، وا پێناسەی فرێز کراوە (( گرێ بریتییە لە دوو وشە یان زیاتر، کە واتای تەواو نەبەخشێت و کاریشی لەگەڵدا نەبێت)).

ئەگەر سەیرێکی ئەم پێناسەیەی سەرەوە بکەین، دەبینین چەند لایەنێکی کەموکوڕی تێدایە:

١ / مەرج نییە هەموو فریزێك لەدوو وشە یان زیاتر پێکبێت، چونکە دەشێ لە تاکە وشەیەکیش پێکبێت.

٢ / مەرج نییە فرێز واتا نەبەخشێت، بەڵکو دەشێ واتا بدات.

٣ / جۆرێك لە جۆرەکانی فرێز، فرێزی کارییە، کە ئەمەش ئەم بۆچونە پوچەڵدەکاتەوە کە دەڵێت نابێت فرێز کارێکی لەگەڵدا بێت.

لەم بارەیەوە (چۆمسکی) پێیوایە، (فرێز) دەشێ وشەیەك بێت یان زیاتر، هەروەها چۆمسکی ئامارە بۆ ئەوەش دەکات کە سادەترین ڕستە لە زماندا لە دووبەش پێکدێت: یەکیان پێیدەوترێ (فرێزی ناوی)، ئەویتریان( فریزی کاری).

هەندێك لە زانایان پێیان وایە ئەم بۆچوونەی چۆمسکی نوێ نییە؛ بەڵکو ئەم بۆچوونە دەگەڕیتەوە بۆ سەردەمانێکی زوو، بەتایبەتی لە سەردەمی یۆنانییەکان (ئەفلاتوون) یەکەم کەس بوو، کە(وتن)ی بەسەر دوو بەش دابەشکرد، کە ئەوانیش


بەناز زۆر خێرا ڕۆیشت.
ف.ن
ف.ک
ناو
ف.ئاوەڵکاری
ف.ک
بەناز
ئاوەڵکاری چەندێتی
ئاوەڵکاری چۆنیەتی
ڕۆیشت
زۆر
خێرا
ڕەگ
کات
بکەر
ڕۆ
ت
Ø

من كچێكی جوانی باڵا بەرزی چاوشینی قــژ زەردم بــینی.



٢/ ڕستە ⟵ ف.ن + ف.ك (ف.ئاوەڵكاری + ف.كاری)

نەسرین زۆر خێرا هات.




٣/ ڕستە ⟵ ف.ن + ف.ك (ف.ن + ف.ك)

كارزان نانی خوارد.



٤/ ڕستە    ف.ن + ف.ک (ف.ن + ف.ئاوەڵناوی + ف.ک)

ئەحمەد کچێکی جوانی بینی.




٥/ ڕستە ——→ ف.ن + ف.ک (ف.بەند + ف.ک)

کارزان بە ئوتومبێل ڕۆیشت.



٦/ ڕستە ⟵ ف.ن + ف.ک (ف.ئاوەڵکاری + ف.بەند + ف.ک)



٧/ ڕستە ⟵ ف.ن + ف.ك (ف.ئاوەڵكاری + ف.ن+ ف.بەند + ف.ك)



٨/ ڕستە ⟵ ف.ن + ف.ک (ف.ن + ف.ئاوەڵناو + ف.ئاوەڵناوی+ ف.ک)

کارزان کچێکی باڵابەرزی چاوشینی بینی.




ڕایخستووە




کچە جوانەکە هات.
ف.ن
ف.ک
ف.ن
ئامرازی دانەپاڵ
ئاوەڵناو
نیشانەی ناسراوی
ڕەگ
کات
بکەر
ناو
ە
جوان
ەکە
هێ (ێ)
ت
Ø
کچ


ڕووباری فورات گەورەیە.
ف.ن
ف.ک
ناو
دانەپاڵ
ناو
ئاوەڵناو
کار
ڕووبار
ی
فورات
گەورە
ڕەگ
کات
نیهاد
ب
ە
Ø


ڕۆیشت
ف.ن
ف.ک
جێناو
ڕەگ
کات
بکەر
ئەو
ڕۆ
ت
Ø

# سـۆسـێر

## فێردیناند دی سۆسێر

ناوی تەواوی (فێردیناند دی سۆسێر)ە، لەساڵی ١٨٥٧ لە جنێف لە سویسرا لەدایکبووە. بە دامەزرێنەری قوتابخانەی بونیادگەریی دادەنرێت، هەروەها سۆسێر بە باوکی زمانەوانی نوێ دادەنرێت. سۆسێر لە بنەماڵەیەکی ناودار هاتۆتە دنیاوە، چونکە باوك و باپیری سۆسێر هەردووکیان زانای گەورە بوون لە بوارەکانی فیزیا و کیمیا، بەجۆرێك هەردووکیان مامۆستای زانکۆ بوون.

سۆسێر لەسەرەتای ژیانیدا حەزی بە بواری زمان نەدەهات، بەڵکو لەبواری تر کاری دەکرد، بەڵام دواتر لەڕێگەی کەسێکەوە بەناوی (بیکێت) ئاشنایەتی لە زماندا پەیداکرد و، بەهۆیەوە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر سۆسێردا هەبوو، بەجۆرێك سۆسێر بەرەو لای زمانەوانی ڕۆیشت و فێری زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانی بوو، هەروەها هانیاندا لێکۆڵینەوە لەبارەی زمانی سانسکریتی کۆن بکات.

وەکو ئاماژەمان بۆی کرد سەرەتای خوێندنی سۆسێر لە زانکۆی جنێف بوو لەبواری کیمیا، پاشان لەساڵی ١٨٧٦ دەچێتە کۆلێژی ئاداب بۆ خوێندنی زانستی زمان، هەر لەوێشەوە ئیتر بیری زمان لای سۆسێر سەری هەڵدا، هەر لەو ساڵەشدا چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی زمانەکانی هیندی و ئەڵمانی بڵاوکردەوە.

سۆسێر لەساڵی ١٨٨١ وەکو مامۆستا لە پەیمانگای خوێندنی باڵا لە پاریس دەستی بە وانەوتنەوە کرد و بابەتی بەراوردکاری زمانی هیندۆ ئەورووپی دەگوتەوە، لەساڵی ١٨٩١ گەڕایەوە سویسرا لە زانکۆی جنێف کورسیەکی دەرس وتنەوەی بۆ تەرخان کرا بۆ ئەوەی کۆرساتی خوێندنی باڵا بە قوتابیان بڵێتەوە لە بوارەکانی زمانی سانسکریتی و ڕستەسازی بەراوردکاری. سۆسێر هەر لە جنێف ژیانی هاوسەری

پێکهێناوە، دوو کـــوڕی هەبوو. لـە ساڵەکانی (١٩٠٦ـ ١٩٠٧)،(١٩٠٩ـ ١٩١٠)،(١٩١٠ ـ ١٩١١) چەند کۆرسێکی خوێندنی بـاڵای گوتۆتـەوە، سۆسـێر لەسـاڵی ١٩١٢ تووشـی نەخۆشی بووە و لەساڵی ١٩١٣ کۆچی دوایی کردووە.

دوای کۆچـــکردنی سۆســـێر لەســـاڵی ١٩١٦ دوو لـــە قوتابییـــەکانی بـــە ناوەکانی(ئەلبێرت و چـارلس بـالی) کتێبەکـەیان بـەناوی (کۆرسـیٚ لـەبارەی زانسـتی زمانی گشتی) بە زمانی فەڕەنسی بلاْوکردەوە، ئەم کتێبە بریتی بوو لەو تێبینیانـەی قوتابییـەکانی سۆسـێر تۆماریـان کردبـوو، بـەو واتایـەی ئـەم کتێبـە بریتـی بـوو لـە محازەڕەکانی سۆسێر لە نێوان ساڵانی(١٩٠٦ــ ١٩١١)، دواتـر بـەهۆی ئـەم کتێبـەوە سۆسـێر شۆڕشـێکی گـەورەی لـەبواری زمانـدا بـەرپاکرد، کەواتـە ئـەم کتێبـە دەروازەیەکـە لـە بۆچـوونەکانی سۆسـێر لـەبارەی زمانـەوە کـە زۆر جـار ئـەم بـۆ چوونانەی سۆسێر بە (دوانەکانی سۆسێر) یان (دوانەکانی زمان ) ناودەبرێت.

## بیروبۆچوونەکانی سۆسێر لەبارەی زمانەوە

### یەکەم/ *دانەکانی زمان*

سۆسـێر لـەبارەی دانـەکانی زمانـەوە، بـڕوای وایـە کـە دەبێـت لـە بچـوکترین دانـەکانی زمانـەوە دەسـت پـێ بکـەین تـا گـەورەترین دانـەکانی زمـان، واتـا بـەپێی بۆچوونی سۆسێر دەبێ لە(فۆنیم)ەوە، کە بچووکترین دانەی زمانە دەست پێ بکەین تـا دەگـەین بـە (ڕسـتە)، کـە گـەورەترین دانـەی زمانە.هـەروەکو لـەم هێڵکارییـەی خوارەوەدا ڕوونی دەکەینەوە:




وەکو دەزانین بە فۆنیمێ یان زیاتر مۆرفیم دروست دەکرێت، بە مۆرفیمێ یان زیاتر وشە دروست دەکرێت، بە وشەیەك یان زیاتر فرێز دروست دەکرێت، بە دوو فرێز یان زیاتر ڕستە دروست دەکرێت.

## دووەم/ پەیوەندی ئاسۆیی و پەیوەندی ستوونی

هەردوو لایەنی ئاسۆیی و ستوونی لە زمان دەکۆڵنەوە، بەڵام بە دوو ئاراستەی جیاواز . پەیوەندی ئاسۆیی زیاتر دەچێتە حاڵەتی ئاستی ڕستەسازی، واتا بریتییە لە پەیوەندی نێوان وشەکان و دەرکەوتن و چۆنیەتی بەدوایەکدا هاتنیان لە سنووری ڕستەدا، بەجۆرێك لەو پەیوەندییەدا چەندێتی هاوڕێیەتی وشەکانی ناو ڕستە دەخاتە ڕوو، بۆ نموونە (دارسێو) هاوڕێیەتی لەگەڵ (زیرەك) نییە، لەهەمان کاتیشدا وشەی (قوتابیەکە) لەگەڵ وشەی (شکا) پەیوەندییان نییە، بەڵکو پەیوەندییەکە لەنێوان

(قوتابیەکە) لەگەڵ (زیرەك)دا هەیە، بەهەمان شێوەش (دارسێو) لەگەڵ (شکا) پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە.

لەم پەیوەندییەدا دەبێت ئاگاداری (کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ) بین، چونکە (کاری تێپەڕ) پێویستی بە سێ کەرەسە هەیە، کە بریتین لە (بکەر و بەرکار و کار)، هەروەها (تێنەپەڕ)یش پێویستی بە دوو کەرەسە هەیە، کە بریتین لە (بکەر و کار)، واتا لە پەیوەندی ئاسۆییدا ئیشمان لەسەر بکەر و بەرکاری ڕاستەوخۆ و کاری ڕستەکە هەیە، هەر بۆیە ئەم پەیوەندیە دەچێتە حاڵەتی سینتاکسەوە، هەر وەکو ڕستەی ( کاروان وانەکەی خوێند)، لێرەدا کارکردنەکە شێوەیەکی ئاسۆیی دەگرێتەخۆ، لەم ڕستەیەدا وشەی (کاروان) بکەری ڕستەکەیە، هەر کاتێکیش بکەرمان دۆزییەوە، ئەوە دەبێت بەدوای کارەکەدا بگەڕێین، کاری ڕستەکەش لەم ڕستەیەدا بریتییە لە (خوێند) و وشەی (خوێند)یش کارێکی تێپەڕە، بۆیە دەبێت بەدوای بەرکاری ڕاستەوخۆدا بگەڕێین، کە وشەی (وانەکە)یە. کەواتە پەیوەندی ئاسۆیی بە شێوەیەکی ئاسۆیی کاردەکات.




پەیوەندی ستونیش بەو پەیوەندییە دەوترێت کە بە شێوەیەکی ستوونی کاردەکات و بریتییە لە دیاریکردنی فەرهەنگی نێوان وشەکان لە هەمان شوێنی وشەی نێو ڕستەکە، لەم جۆرەدا دەشێ وشەیەکی نێو ڕستەکە لابەرین و چەندین

وشـەی تـرى لەشـوێن دابنـێین، چـونکە کارکردنەکـە لەسـەر بنـەمای وشەسـازییە و کارکردنەکەش هێڵێکی ڕاست دەگرێتەخۆ.

یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی پەیوەندی ستوونی ئەوەیە کە بەشە ئاخاوتنـەکانی زمان دیاری دەکات، بە واتایەکی تر پۆلە زمانییەکان دیاری دەکات، کە بریتین لـە: (نـاو، جـێناو، ئـاوەڵناو،......)، هەروەك لەم ڕستەیە دەیخەینە ڕوو:

| | | |
|---|---|---|
| کـارزان نـانی خوارد. | کـارزان نـانی خـوارد. | کـارزان نانی خـوارد |
| بـەنـاز | ئـاوی | کـڕی |
| ئەحمـەد | شەربەتی | هـێنا |
| شـیلان | چـا | بـرد |

لەم نموونانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە پەیوەنـدی سـتوونی بەشـە ئاخاوتنەکەی دەست نیشان کردووە، بەجۆرێك ئەو وشانەی کە لەگەڵ هـەمان بەشـە ئاخاوتن دێت خستویانە ڕوو، چـونکە لـە خانـەی یەکەمـدا لـەجیاتی نـاوی (کـارزان) چەندین ناوی ترمان هێناون، کە ناوی تایبەتی و ناسراون، واتـا سـەر بەهـەمان پـۆل بـوون. لـە خانـەی دووەمیشـدا لـەجیاتی نـاوی (نـان) کۆمـەڵێك نـاوی تـری گشـتی نەناسراومان هێناوە، لەخانەی سێیەمیشـدا ئیشـکردنەکەمان لەسـەر کـاری ڕسـتەکە بووە، بۆیە کارێکمان هێناوە، کە لەگەڵ ڕستەکەبگونجێ، لێـرەدا سنوری کـارکردنی پەیوەندی ستوونی زۆر فراوان بووە، چونکە توانیمان دەیەها وشە لەشوێن خانـەکان بەکاربهێنین، بەڵام ڕەنگە لەهەندێ حاڵەتـدا سـنورەکە زۆر تەسـك بێتـەوە، واتـا زۆر زەحمەتە وشە لەشوێن وشەیەکی تر بەکار بێت،بـۆ نموونە:

**سـەگەکە وەڕی.**

لێرەدا ناتوانین وشەی سەگەکە لابەرین، واتا پەیوەندی ستونییەکە زۆر تەسك بۆتەوە، چونکە وەڕین تەنها بۆ سەگە.

پ/ ئایا دەکرێت هەردوو پەیوەندی ستوونی و ئاسۆیی لەسەر یەك ڕستە بەکاربێت؟

و/ بەڵێ دەکرێت هەردوو پەیوەندییەکە لەسەر یەك ڕستە جێبەجێ بکرێت، بەلأم هەردووکیان لەسەر ئاراستەکەی خۆیان، واتە پەیوەندی ستوونی بە ئاراستەی وشەسازی و پەیوەندی ئاسۆیی بە ئاراستەی ڕستەسازی.

## ***سێیەم/ ئاخاوتن و نووسین***

ئاخاوتن و نووسینیش یەکێك بوون لە بۆچوونەکانی سۆسێر، ئەوەی جێگەی ئاماژە پێکردنە لەپێش سۆسێر تەنیا گرنگی بەبواری نووسین دەدرا، بەتایبەتی نووسینی کەڵەپیاوان و ئەدیبان و شاعیران، بە واتایەکی تر بەهیچ شێوەیەك ئاوڕیان لەئاخاوتن نەدەدایەوە، بەلأم سۆسێر بەپێچەوانەی سەردەمی پێش خۆی زیاتر گرنگی بە ئاخاوتن دەدا، نەوەك نووسین، چونکە وەك خۆی ئاماژەی بۆ دەکرد ئاخاوتن پێش نووسین پەیدابووە و لەژێر کاریگەریی ئاخاوتنەوە نووسین پەیدابووە، بەو واتایەی ئەوەی دەشنووسرێت هەر لە ئاخاوتن وەردەگیرێت، هەر بۆیە سۆسێر جیاوازی لەنێوان ئاخاوتن و نووسین کردووە.

| ئـاخـاوتن | نـووسـین |
| --- | --- |
| ١ـ ئاخاوتن پێش نووسین پەیدا بووە. | ١ـ نووسین دوای ئاخاوتن پەیدا بووە. |
| ٢ـ لە ئاخاوتندا پێویستمان بە قسەکەر و گوێگر هەیە. | ٢ـ لە نووسیندا پێویستمان بە خوێنەر هەیە. |
| ٣ـ ئاخاوتن لە دەنگ پێکدێت. | ٣ـ نووسین لە پیت و هێما پێکدێت. |
| ٤ـ ئاخاوتن تاڕادەیەکی زۆر ڕەمەکییە. | ٤ـ نووسین تاڕادەیەکی زۆر ڕەمەکی نییە. |
| ٥ـ لە ئاخاوتندا زمانی ستاندارد نییە. | ٥ـ لە نووسیندا زمانی ستاندارد هەیە. |
| ٦ـ هێز و ئاواز لە ئاخاوتندا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن. | ٦ـ لە نووسیندا زیاتر لایەنی خاڵبەندی ڕۆڵدەگێڕێت. |
| ٧ـ ئاخاوتن بەهۆی گوێوە وەردەگیرێت. | ٧ـ نووسین بەهۆی چاوەوە وەردەگیرێت. |

## چوارەم/ هێما و هێمابۆکراو

بـە بۆچـوونی سۆسـێر وشـە دوو ڕووی هەیـە، کـە ئـەویش (نـاوەوەی زمـان و دەرەوەی زمـان)ە. نـاوەوەی زمـان هێماکـە یـاخود وشـەکە دەگرێتـەوە، بـەلام دەرەوەی زمان هێمابۆکراو دەگرێتەوە. بۆ نموونە وشەی (دار) دەچێتە حاڵەتی هێما و نـاوەوەی زمـان، کەچـی پێکهاتـەی دارەکـە واتـا (دار)دەرەوەی زمـان یـان هێمابۆکراو دەگرێتەوە، کەواتە وشە ئەم دوو ڕەگەزە لەخۆدەگرێت:

١ـ وێنەی دەنگی، کە بریتییە لە هێما.

٢ـ هێمابۆکراو، کە چەمك و واتا دەگەیەنێت، ئەو شتانەیە کە هێماکە دەینوێنێت.

لـەپێش سۆسـێر پەیوەنـدی هێمـا و هێمـابۆکراو باسـکراوە، لای یۆنانییـەکان بەتایبەتی لای ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئاماژە بەم دوو کەرەسە کراوە، هەریەکـەیان بـە بۆچوونێك ئەم پەیوەندیەیان خستۆتە ڕوو، سۆسێر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و دەڵێت: پەیوەندی نێوان هێما و هێمابۆکراو سروشتی و لەخۆوەیە.

لەدوای (سۆسێر)یش (ڕیچاردز و ئۆگدن) لەکتێبی خۆیاندا کە لە سـاڵی ١٩٢٣ بەناونیشانی (واتای واتا) بلاوکراوەتەوە، تیایدا سـوودیان لـە بۆچـوونەکەی سۆسـێر بینیوە، بەلام ڕیچاردز و ئۆگدن پەیوەندییەکەیان خستۆتە نێو سێگۆشەیەکەوە، کـە بــە سێگۆشــەی (واتــایی) نــاوی دەرکــردووە، کــە یەکێکــە لــە گریمــانەکانی واتــاســازی.

**بـۆچوونی سۆسێر**

هـێما ــــــــــــ هـێمابۆکـراو

وشـــە ــــــــــــ ناولێنراو، تـەن

بۆچوونی ڕیچاردز و ئۆگدن




بەگوێرەی بۆچوونی سۆسێر دەبێت هەموو وشەیەك یاخود هێمایەك لە بەرانبەریدا هێمابۆکراوێك یان تەنێك داگیر بکات، کە ئەمەش مەرج نییە وابێت، چونکە دەیەها وشەما لە زماندا هەیە لە بەرانبەریاندا هێمابۆکراویان نییە و تەنێك داگیر ناکەن، وەك ئامرازی پەیوەندی و پێشبەند و ئاوەڵکار و ئاوەڵناو........

## پێنجەم/ زمان، زبان، گوتن:

سۆسێر توانی جیاوازی لە نێوان (زمان و زبان و گوتن) بکات، کە ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی خستە ناو زمانەوانییەوە، سۆسێر بەم شێوەیەی خوارەوە جیاوازی لەنێوان ئەم سێ کەرەسەیەدا کرد:

**١- زمان /** زمان لایەنێکی گشتییە لای مرۆڤ، واتا بریتییە لەو توانایەی کە لە مرۆڤدا هەیە، زمان لای سۆسێر هەروەکو (توانست)ە لای چۆمسکی، واتا ئەم دوو زانایە لەم خاڵەدا هاوبەشن و باوەڕیان وایە کە مرۆڤ کاتێك لەدایك دەبێت لەگەڵ لەدایکبوونی توانایەکی گشتی یاخود دیاردەیەکی گشتی لەگەڵی لەدایك دەبێت، بەهۆیەوە توانای ئەوەی هەیە ئەو مرۆڤە فێری زمان ببێت، ئەم فێربوونەش وەنەبێت لەسەر زمانێکی

دیاریکراو یان تاکە زمانێك بێت، بەڵکو ئەم توانایە ئەوەشدەردەخات، کە هەموو مرۆڤێك توانای ئەوەی هەیە، فێری هەر زمانێك لە زمانەکانی جیهان بێت، ئەم جۆرە لای سۆسێر بە کەڵکی زمانەوانی نایەت، واتا گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادات،چونکە کاری زمانەوانی دۆزینەوەی یاسا و کەرەسەکانی زمان و پەیوەندی نێوانیانە.

**٢ــ زبــان/** ئەمەیان دیاردە و لایەنێکی تایبەتی یاخود لایەنێکی کۆمەڵایەتی دەگرێتەخۆ، لەم جۆرەدا تاکەکەس ناتوانێت کاری تێدا بکات یان بیگۆڕێت، چونکە زبان لەژێر دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە، واتا بەشێوەیەکی گشتی زبان بریتییە لە (گۆکردن، ڕێزمان، وشە). زبان لەگوتندا نەبێت دەرناکەوێت، چونکە زبان کەرەسە و یاساکانی تێدایە، ئەم بەشەیان یاساکانی زمان دەگرێتەخۆ، هەر بۆیە سۆسێر گرنگییەکی زۆر بەم بەشەیان دەدات و کردوویەتی بە بنەمای لێکۆڵینەوەکانی.

**٣ـ گوتن/** ئەو چالاکییە هەست پێکراوە کەسییەیە، کە دێتە دەربڕین لەکات و شوێنێکی دیاریکراودا، ئەمەیان لەژێر دەسەڵاتی مرۆڤدایە، هەر بۆیەشە مرۆڤ تاڕادەیەکی زۆر سەربەستە لە هەڵبژاردنی وشەکان، کەواتە گوتن ئەو زمانەیە کە مرۆڤ بەکاری دێنێ و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێ، بەڵام هەموویان ڕێزمان و بنەما و یاساکانی زمان و لایەنە گشتییەکان بەیەکەوەیان دەبەستێ، سۆسێر گرنگی و بایەخ بەم لایەنەش دەدات.

## شەشەم/ پەیوەندی ئێستایی و پەیوەندی مێژوویی

ئەم دوو زاراوەیە سۆسێر لەبواری زمان بەکاری هێناون، هەردووکیان لێکۆڵینەوەن لەبارەی زمان، لایەنی مێژوویی شیکردنەوەی زمانە لەسەر بنەما و قۆناغە جۆر بەجۆرەکانی زمان، بە واتایەکی تر لایەنی مێژوویی لە گەشە و

پەرەسەندن و گۆڕانەکانی زمان لە قۆناغە جۆربەجۆرەکان دەکۆڵێتەوە، بەلاّم پەیوەندی ئێستایی جەخت لەسەر ڕەوشی ئێستای زمانەکە دەکات، بەو واتایەی خۆی بەو هەموو گۆڕان و پەرەسەندنانەی قۆناغە یەك بەدوای یەکدا هاتووەکانی زمان نابەستێتەوە، سۆسێر زیاتر گرنگی بە لایەنی ئێستای زمان دەدات، واتا بایەخێکی ئەوتۆ بە مێژوویی نادات، چونکە بەبڕوای سۆسێر لایەنی ئێستایی گرنگترە لە لایەنی مێژوویی، ئەمەش بۆ ئەوەی ئەگەر لایەنی ئێستایی نەبێت ناتوانین لێکۆڵینەوە لەمێژوویی زمانەکە ئەنجام بدەین، هەر بۆیەشە سۆسێر سێ تەوەرە بۆ لایەنی ئێستایی دیاری دەکات:

١- کات/ دەبێت ئەو ماوەیە دیاری بکرێت کە لێکۆڵینەوەی تێدا دەکرێت، چونکە بە تێپەڕبوونی کات زمان دەگۆڕێ، بەشێوەیەك کە هەستی پێناکرێت، هەرچەندە گۆڕان لە زماندا لەسەرخۆیە، بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا کارێکی بەردەوامە.

٢- شوێن/ کاتێ لێکۆڵینەوە لەسەر زمانی کۆمەڵگەیەك ئەنجام دەدرێت، پێویستە شوێنی ئەو کۆمەڵگایە دەست نیشان بکرێت، چونکە زمان بەپێی شوێن دەگۆڕێت.

٣- چین/ زمان تەنها بە گۆڕینی کات و شوێن ناگۆڕێت، بەڵکو هۆکاری تریش هەیە دەیگۆڕێ، ئەویش (ئاست یان چین)ە، واتا زمان لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر دەگۆڕێ، واتا زمان بەپێی ئاستی قسەکەر دەگۆڕێ، زمانی ئەدەبی لە زمانی بازار و زمانی قوتابخانەکان جیاوازە.

## چۆمسکی

ناوی تەواوی نەوام (نەعوم) لەساڵی ١٩٢٨ لە فیلادلفیا لە ئەمریکا لەدایکبووە، چۆمسکی لە بنەماڵەیەکی جولەکەی ڕۆشنبیرە، بەجۆرێك دایك و باوکی بە دوو ڕێزماننووسی گەورەی زمانی عیبری دادەنرێن، باوکی چۆمسکی ناوی (ڤیلیا چۆمسکی) و دایکیشی ناوی (ڤیکۆ ئیسرائیل)ە، باوکی چۆمسکی قوتابخانەیەکی تایبەتی زمانی عیبری لە (فیلادلفیا) دروستکرد، دواتر چووە کۆلیژ و لەوێ زمانی عیبری وتۆتەوە، ڤیلیا چۆمسکی بە ڕێنماییکەری جولەکەکانی فیلادلفیا دادەنرا، خاوەنی چەندین کتێبە لەوانە: (زمان و یاسای عیبری ) لەسەدەی هەژدەهەمدا.

چۆمسکی هەر لە منداڵییەوە زیرەکی و بلیمەتی پێوە دیاربوو، چونکە لە تەمەنی (١٠) ساڵی خوێندنەوەیەکی بۆ کتێبەکەی باوکی کرد، بەلأم بلأوی نەکردەوە.جێگای ئاماژە پێکردنە چۆمسکی دەرچووی بەشی ماتماتیکە لە زانکۆی (پەنسلڤانیا)، هەر لەم زانکۆیەش چۆمسکی پەیوەندی بە ڕێکخراوێکی توندڕەوی جولەکە کرد و بووە کادیرێکی چالاکی ئەم ڕێکخراوە، هەر بۆیە ئەوکات هاتە فەلەستین بۆ پاڵپشتی کردنی بەرژەوەندییەکانی جولەکە، دواتر باوکی چۆمسکی هەوڵدەدات چۆمسکی لە زمان نزیك بکاتەوە، ئەمیش لە ڕێگەی زمانەوانی بەناوباونگ (هاریس) ەوە ەوڵیدا چۆمسکی لەبواری زمانەوانی نزیك بکاتەوە، واتا چۆمسکی لەڕێگەی هاریسەوە چۆتە ناو بواری زمانەوانی، چۆمسکی لەباری کاریگەربوونی خۆی بە بابەتی زمانەوانی دەڵێت: ئەو کتێبەی کەزۆر کاریگەری خستەسەرم و زمانناسی پێ ناساندم کتێبی (شێوەکانی زمانناسی) هاریس بوو، هەر ئەمەش وایکرد پەرە بەبواری زمانەوانی بدەم.

چۆمسکی لەساڵی ١٩٥١ بڕوانامەی ماجستێری لە زانکۆی پەنسلڤانیا وەرگرتووە و ناونیشانی نامەکەشی بەناونیشانی(واژەناسی زمانی عیبری نوێ)

بوو.نامــەی ماجســتێرەکەی چۆمســکی ڕەخنەیــەکی زۆری لــێگیرا، تەنانــەت یــەکێك لەئەندامانی گفتوگۆی نامەکەی دەڵێت:(ئەم نامەی ماجستێرە هــەموو شــتێکە تــەنیا بابەتی زمانەوانی نەبێت).

پاش تێپەڕبوونی (٤) ساڵ، واتا لەســاڵی ١٩٥٥ چۆمســکی بڕوانامــەی دکتــۆرای بەدەست هێناوە. چۆمسکی خاوەنی چەندین کتێــب و وتــاری زمانــەوانی و ڕەخنــەی سیاسییە، لێرەدا هەندێك لە کتێبەکانی چۆمسکی دەخەینە ڕوو:

**١- ڕۆنانە سینتاکسیەکان:** ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٥٧ لەلایەن چاپ و پەخشی مۆتــان بلاّوکراوەتەوە، ئەم کتێبە تائێستا وەرگێڕاوەتە سەر زۆربەی زمانەکانی جیهان.

**٢- بونیادی لۆژیکی تیۆری زمانەوانی:** ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٧٢ بلاّوکراوەتەوە.

**٣- گۆشە نیگاکانی تیۆری سینتاکسی:** ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٦٥ بلاّوکراوەتــەوە.

**٤- زمانەوانی دیکارتی:** ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٦٦ بلاّوکراوەتەوە.

**٥- زمـان و بـیر:** ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٦٨ بلاّوکراوەتـــــــەوە.

**٦- مەسەلەکانی زانین و ئازادی:** ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٧١ بلاّوکراوەتەوە.

**٧ــ جۆرەکــانی فۆنۆلــۆژی لــە زمــانی ئینگلیزیــدا:** ئــەم کتێبــە لەســاڵی ١٩٦٨ بلاّوکراوەتەوە.

**٨ــ لێکۆڵینــەوەی واتاســازی لــە ڕێزمانــدا:** ئــەم کتێبــە لــە ســاڵی ١٩٧٢ بلاّوکراوەتـــــەوە.

**٩- زانینی زمــانەوانــی/ سروشت و بنەماو بەکارهێنانەکان:** ئەم کتێبە لەساڵی ١٩٧٢ بلاّوکراوەتەوە.

چۆمســکی تائێســتا چــەندین بڕوانامــەی ڕێزلێنــانی لــەبواری زمانــەوانی و سیاســەت وەرگرتــووە، دیــارە ئــەم بڕوانامانــەش بەشــێوەیەکی ڕەمەکیانــە نــەبووە،

بەڵکو دوایِ هەڵسەنگاندنی کارەکانی لەلایەن چەندین زانکۆ و پەیمانگای گەورەی جیهان ئەنجامدراوە، وەکو (زانکۆی لەندەن، زانکۆی شیکاگۆ، زانکۆی ئۆکسفۆرد......،هتد).جێگای ئاماژەپێکردنە چۆمسکی تائێستا لەژیانداماوە و بەردەوامیشە لە لێکۆڵینەوە لەبواری زمان و سیاسەتدا.

## بیروبۆچوونەکانی چۆمسکی لەبارەی زمانەوانییەوە:

### ١ـ دانەکانی زمان

چۆمسکی پێی وایە دەبێت لە گەورەترین دانەکانی زمانەوە دەست پێ بکەین، کە ڕستەیە بۆ بچووکترین دانە، چونکە چۆمسکی هەموو شتێکی لەڕوانگەی ڕستەوە سەیر دەکرد، بەهۆیەوە ڕستەی بە چەقی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی دادەنا. لێرەدا جیاوازی نیوان چۆمسکی و سۆسێرمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە ئاراستەکردنی دانەکانی زمان، چونکە سۆسێر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا، پێی وابوو دەبێت لە بچوکترین دانەی زمانەوە دەست پێ بکەین، کە فۆنیمە، بەلاَم ئاراستەکە لای چۆمسکی لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەڕوات، واتا لەڕستەوە تا دەگاتە فۆنیم یان دەنگ.




## ٢ـ زمانی ستاندەر

چۆمسکی دەڵێت لە نووسین و نموونەی پراکتیکیدا نموونەیەك بهێنەوە کە لـە زمانی ستاندەرەوە وەرگیرابێت، بەو واتایەی پەیوەندی بە (زار و بنزار و گۆڤەر)ەوە نەبێت، چـونکە هـەرکاتێك نموونەیـەك بهێنیـەوە لـە زارێـك لـە زارەکـانی زمانەکـەوە وەرگیرابێت، ئەمە لای چۆمسکی بە هەڵە دادەنرێت.

هەندێ لە زمانەوانان دژی ئەم بۆچوونەی چۆمسکین، بـە جۆرێـك پێیـان وایـە چۆمسکی دژی زار و بنزارە، بەو واتایەی چۆمسکی دژی زمانەوانی کۆمەڵایـەتی (کـۆ زمانـەوانی) بێـت، بـەڵام چۆمسـکی وەڵامیـان دەداتـەوە و دەڵێـت: مـن دژی زار و شێوەزار نـیم لـە زمانـدا، بـەڵام لـەبواری زمانـدا دەبێـت ئێمـە پـەیڕەوی نووسـین و نموونەی ستاندەر بین.

- لـەکوێ دەژی. √

- لە کێندەری دەژی. X

- چۆلەکە بکرە. √
- کێشکە بکرە. X

## ٣ـ توانست و چالاکی

بەبۆچوونی چۆمسکی توانست لەگەڵ لە دایکبوونی مرۆڤ لەدایک دەبێت، توانست نابینرێت و ناگوترێت و هەستی پێناکرێت، بەڵکو کۆمەڵێك زانست و زانیارییە کە لەگەڵ لەدایکبونەوە پەیدا دەبێت، لە توانستدا هەڵە ناکرێت، بەلاّم لە چالاکیدا هەڵە دەکرێت، چونکە دەبینرێت و هەستی پێدەکرێت، لەتوانست و چالاکیدا چۆمسکی نموونەیەك لە ژیانی ڕۆژانە دەهێنێتەوە، کە وەك ئەوەیە یەکێك بەشداری خولی فێربوونی لێخوڕینی ئۆتۆمبێل بکات، ئەو کوڕاسەیەی کە لە خولەکەدا وەریدەگرێت، هەمووی زانست و زانیارییە، ئەو زانست و زانیاریانە دەچنە بواری توانستەوە، بۆیەشە هەڵەیان تێدا نییە، لەکاتی جێبەجێکردنیدا مرۆڤ هەڵە دەکات.

توانست و چالاکی لای چۆمسکی هەردووکیان گرنگن، بەلاّم لەهەندێ حاڵەتدا گرنگی چالاکیەکە دەکەوێتە پێش توانست، بۆ نموونە ئەگەر لەدوورگەیەکدا پیاو و ژنێکی کەڕ و لاڵ بژین، دواتر منداڵێکیان ببێت، ئەوە ئەو منداڵە فێری زمان نابێت، یاخود تەنیا فێری زمانی هێما دەبێت. ئەگەر چی ئەم منداڵە توانستەکەی لەگەڵدا لەدایکبووە، بۆ ئەوەی فێری زمان ببێ، بەلاّم لەبەرئەوەی زمان پێویستی بە چالاکی هەیە، بۆ ئەوەی کردەی ئاخاوتن دروست بێت. هەر بۆیەشە یەکێك لە گریمانەکانی زمان پەیوەستە بە کۆمەڵگا یان لایەنی کۆمەلاّیەتییەوە.

چۆمسکی ئاماژە بە ئەوە دەکات کە لەتوانستدا فێری زمان دەبێت، جا ئەو زمانە زمانی کوردی یان هەر زمانێك بێت. بۆ نموونە کەسێك لە شارۆچکەی قەلاّدزێ لەخێزانێکی کوردی موسوڵمان لەدایك بێت، دواتر ئەم منداڵە یەکسەر بگوازرێتەوە بۆ

لــەنـدەن و بچێتە ناو خێزانێکی مەسـیحی، دەبیـنین ئـەو منداڵـە بـە ئاسـانی فێـری زمانی ئینگلیزی دەبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کـە توانسـت زانسـت و زانیـاری و دەستورە لەبارەی زمـــــان.

**٤ـ ئاستی ڕووکەش و ئاستی قووڵ ( ڕۆنانی سەرەوە و ڕۆنانی ژێرەوە ) ( دیوی ڕوخسار و دیوی ناوەڕۆک )**

چۆمسکی باس لـە دوو ئاسـت دەکـات، یـەکێکیان ڕۆنـانی سـەرەوەیە ئـەویتر ژێرەوە، ڕۆنانی سەرەوە ئەو کەرەسـانەن لەسـەرەوە دەردەکـەون، کـە مـەرج نییـە هەموو کەرەسەکان بگرێتەخۆ، ئاستی ژێرەوە ناوەڕۆك و بنجی ڕستەکە دەگرێتەخۆ، چونکە لەهەندێ حاڵەتدا هەندێ کەرەسە دەرناکەون، بەڵام لەئاستی ژێرەوە بوونیان هەیە، وەك:

- ئـــازاد دەتوانێ بنووسـێ.

لـەم ڕسـتەیەدا یـەکێك لـە کەرەسـە سـەرەکییەکان دەرنەکـەوتووە، ئـەم کەرەسەیە لە ناوەڕۆکـدا بـوونی هەیـە، چـونکە تێپـەڕ پێویسـتی بـە دوو کەرەسـەی سەرەکی هەیە، ئەویش بکەر و بەرکارە، بەو واتایـەی لـەو ڕسـتەیەدا ئـازاد دەتـوانێ شتێ بنووسێ، ئەویش دەبێتە بەرکاری ڕستەوخۆی ڕستەکە.

**٥ـ ڕێزمانی گشتی و ڕێزمانی تایبەتی**

مەبەست لە ڕێزمانی گشتی باسی ئەو دیاردە زمانیانـە دەکرێـت، کـە لەهـەموو زمانەکاندا بوونی هەیە، بەو واتایەی زۆربەی بابـەت و کەرەسـە ڕێزمانیـەکان دەچـنە ژێر باڵی ڕێزمانی گشتییەوە، بە بڕوای چۆمسکی ئەو کەرەسانە لەهـەموو زمانەکانـدا هاوبەشن، وەك: (ناو، جێناو، ئاوەڵنـاو ...،کـار، بکـەر، بـەرکار...، ڕسـتەی سـادە، ڕستەی لێکدراو، ڕستەی هەواڵگەیاندن)، لە هەموو زمانەکاندا هەن.

ڕێزمانی تایبەتی ئەو بابەتە زمانیانە دەگرێتەخۆ، کە تایبەتە بە زمانێکی دیاریکراو و مەرج نییە لە زمانێکی تردا بوونیان هەبێت، بۆ نموونە نیشانەی شیکردنەوە کە تایبەتە بە زمانی عەرەبی، وەك: کسرە،فتحە،ضمة ( ژێر، سەر و بۆر ).

## ٦- زمان

چۆمسکی لەبارەی پێناسەکردنی زماندا دەڵێت: (زمان کۆمەڵە وشەیەکە ڕێزمان دەریان دەکات)، چۆمسکی زمان لە کۆمەڵگا دادەبڕێت، کە هەر ئەمەش وایکرد پراگماتیکناسەکان ڕەخنەیەکی زۆر ئاراستەی چۆمسکی بکەن، چونکە پراگماتیکناسەکان پێیان وایە زمان پەیوەستە بە کۆمەڵگا، لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ سۆسێریش یەك ناگرێتەوە، سۆسێر پێی وایە زمان سیستەمە، بەڵام چۆمسکی پێی وایە زمان وەگەڕخەری سیستەمی ناو مێشکە.

## ٧- بەرهەمهێنانی ڕستە

چۆمسکی پێی وایە مرۆڤ لەتوانایدایە ژمارەیەکی زۆری ڕستە بەرهەم بهێنێ، بەجۆرێك ئەم ڕستانە پێشتر نەیبیستبێ و نەیوتبێ، واتا مرۆڤ توانستێکی لە ڕادەبەدەری هەیە ڕستە دروست بکات و لەنێو ڕستەکەشدا فرێز و وشە بگرێتەخۆ، جێگای ئاماژە پێکردنە بەرهەمهێنان یەکێکە لە تیۆرەکانی چۆمسکی و لەبارەی بەرهەمهێنانەوە چۆمسکی خۆی لە کۆمەڵێ یاسای جۆراو جۆر دەبینێتەوە.

## ٨- جیاکردنەوەی ڕستەی ڕێزمانی و ناڕێزمانی

لە ڕستەسازیدا چۆمسکی ڕستەی ڕێزمانی و ناڕێزمانی لەیەکتر جیادەکاتەوە،وەك:

- هەموو قوتابیەکان نانیان خوارد. ڕێزمانی
- قوتابیەکان نانیان خوارد هەموو. نارێزمانی

هەروەها چۆمسکی لەنێوان ڕستەی ڕێزمانی و ڕستەی نارێزمانی هەندێ پلە و قۆناغ دیاریدەکات، ئەم پلە و قۆناغانەش دەچنە نێو (ڕێزمانی و نارێزمانی)، ڕێزمانی و نارێزمانی ڕستەش لە ڕستەسازیدا پەیوەستە بە ڕیزبوونی کەرەسەکان لەنێو ڕستە، بەجۆرێك هەر زمانێك شێوازی تایبەتی بەخۆی هەیە لەڕیزبوونی کەرەسەکان.

- هەموو قوتابیەکان نانیان خوارد. ڕێزمانی
- قوتابیەکان هەموو نانیان خوارد. نزیکە لەڕێزمانی
- قوتابیەکان نانیان هەموو خوارد. نزیکە لەڕێزمانی
- قوتابیەکان نانیان خوارد هەموو. نارێزمانی

٩- لە زماندا هەندێك ڕستەمان هەیە لێڵە، بەهۆیەوە چۆمسکی لێڵی ئەم ڕستانەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، ئاخۆ سەرچاوەکەی نزیکە لەلایەنی ڕێزمانییەوە یاخود پەیوەستە بەلایەنی وشەوە.

پێم دەخورێ.

| لێڵی ڕێزمانی | لێڵی وشە |
|---|---|
| بە من دەخورێ. | قاچم دەخورێ |
| بە ← پێشبەند (سەربەخۆ) ← (پێ) بەند | پێ ← قاچ |
| من ← جێناو (سەربەخۆ) ← (م) لکاو | دەخورێ ←(خوران)، (خواردن) |

## قوتابخانەی بەرهەمهێن

مەبەست لە قوتابخانەی بەرهەمهێن ئەو کۆمەڵە تیۆرە زمانەوانییەیە، کە زمانەوانی ناسراوی ئەمریکی نەوام چۆمسکی (لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٨) و هۆگرانی لە کۆتایی پەنجاکاندا پێشیان خست، کاریگەری ئەم هەنگاوە زانستییەش جگە لە بوارە زمانەوانییەکاندا پەلی بۆ بوارەکانی دی وەکو بواری فەلسەفە و دەروونناسیش کێشا، ئەم قوتابخانەیە لە پرۆگرامەکانی خۆیدا پشت بە بەکارهێنانی یاسا بەرهەمهێنەکان دەبەستێت. کاریگەری ئەم قوتابخانەیە لە تیۆرەکانی ڕێزمانیشدا گەیشتە ڕادەیەك کە دەتوانین بڵێین ڕێزمانی بەرهەمهێن لەم چل ساڵەی کۆتایی ڕێزمانێکی باو و باڵا دەست بووە. هەروەها ئەو قەناعەتە باوەی کە لە نێوان زۆربەی زۆری زمانناسەکانی ئەم سێ دەیەی دوایدا هەیە ئەوەیە کە بوونی تیۆرێکی ڕێزمانی ئەوتۆ بەگوێرەی پابەندبوونی بەو بنەمایانەی کە بەرهەمهێنەکان دایانهێناوە، دەپێورێت.

پاشان ساڵی (١٩٥٧) (ئەو ساڵەیە کە نەوام چۆمسکی پەرتووکەکەی خۆی بەناوی (ڕۆنانە سینتاکسییەکان) تیادا بڵاوکردەوە، ئەم ساڵەش بە خاڵێکی وەرچەرخانی سەدەی بیستەم هەژمار دەکرێت لە بواری توێژینەوە زمانەوانییەکاندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا با تۆسقاڵێك دادپەروەر بین و ئەوە بڵێین کە هەندێ زمانەوان پێیان وایە کە ساڵی (١٩٥٩) ساڵێکی زۆر گرنگە لەم بوارەدا، ئەویش کاتێك بوو کە چۆمسکی لە پێداچوونەوەیەکی توندا ئەو پرۆگرامە ڕەوشتکارییەی ڕەتکردەوە لە بواری بەکارهێنانی زماندا، بەو وەسفەی بەرهەمێکی پەسەند نەکراوی ئەزموونگەرایی یەکلاکەرەوەی قوتابخانەی ڕەوشتکاری (بلۆمفیلد)ییە.

(چۆمسکی) بنەمای فەلسەفی (یاسای بلۆمفیلد)ی خستە ژێر گوڕەشەی خۆیەوە و هەر لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە پێشڤەچوونە زمانەوانییەکان خەریك بوو ببنە

دەرەنجامێکی ئەو چاو پێداخشاندن یا هەمواركردنانەی بۆچوونەکانی چۆمسکی کە زیاتر گۆڕانکارییە تایبەتییەکانی خۆی دەگرێتەوە کە لە بواری تیۆری زمانەوانیدا ئەنجامیدا، بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین کە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم چەرخی ڕێزمانی بەرهەمهێنی گوێزانەوەیە[1].

بیرۆکەی سەرەکی کە پرۆگرامی بەرهەمهێن ئاراستەی دەکات، بەرهەمهێنانە لە بواری زماندا کە بە پێی ئەم پرۆگرامە قسەکەر دەتوانێ کۆمەڵێ ڕستە دروست بکات کە بێ کۆتایین و پێش وەختیش گوێی لێیان نەبووە. ئەمەش خودی ئەو مۆرکەیە کە مرۆڤ لە ئامێر و ئاژەڵان جیا دەکاتەوە، جا گەر منداڵان توانیان کۆمەڵێ ڕستە بەکاربێنن کە لەلای گەورەکان پەسند بن، ئەمەش مانای ئەوەیە کە مەسەلەکە تەنها لاسایی کردنەوەی ئەو ڕستانە نییە کە لە گەورەکانەوە گوێیان لێ بووە، بەڵکو شتێك لە ئارادایە ئەویش ئەوەیە کە منداڵان بە توانایەکی زمانەوانی لە دایك دەبن کە وایان لێ دەکات بتوانن قسە بکەن. جا گەر مەسەلەکە وابێت کەواتە پێویستە لەو توانایە بکۆڵینەوە کەوا لە قسەکەر دەکات کۆمەڵێ ڕستەی تازە دروست بکات و لێی تێ بگات، ئەویش لە جیاتی ئەوەی کە گرنگی بە کۆکردنەوەی ئەو ماددە زمانەوانییانە بدەین کە قسەکەران قسەی پێ دەکەن، چونکە چەندە لە ڕووی کۆکردنەوەی ماددە زمانەوانییەکەوە فراوانخواز بین، ئەوا ئێمە ناتوانین سەرتاپای ئەو ماددە زمانەوانییە ڕووماڵ بکەین، کە پێویستیمان پێ هەیە، بگرە لەوانەیە تەنانەت ڕێژەیەکی کەمیشی ناتوانین لێ ڕووماڵ بکەین.

جا بە ڕادەی سەرکەوتنمان لە دۆزینەوەی ئەو یاسایانەی کە قسەکەران بۆ پیادەکردنی پێکهاتە زمانەوانییەکان پشتی پێ دەبەستن، هەر بەو ڕادەیەش

---

[1] See Robins , 1997: 260.

دەتوانین کە شرۆڤەیەکی زانستی پەسەندکراو سەبارەت بە تایبەتمەندیەتی بەرهەمهێنان لە زماندا پێشکەش بکەین[١].

## ڕێزمانی بەرهەمهێن

ڕێزمانی بەرهەمهێن زاراوەیەکە (بەو کۆمەلە یاسایە دەوترێت کە چەند جۆرێکی سیستەمەکانی زمان دەست نیشان دەکات)، دەشتوانین وردتر بلێین کە ڕێزمانی بەرهەمهێن (ئەو کۆمەلە یاسایەیە کە لەسەر فەرهەنگێکی سنووورداری یەکەکان پراکتیزە دەبن و کۆمەڵە پێکهاتەیەکی (بێ سنوور وەیاخود سنووردار) بەرهەم دێنن)، کە لە ژمارەیەکی کەمی یەکەکان دروست بوون، بە شێوەیەك کە بەم کۆمەلە یاسایە هەموو پێکهاتەیەك تەواو وەسف بکەین کە پیادە کردنەکەی ڕاست و دروستە، ئەویش لەو زمانەی کە ڕێزمان وەسفی دەداتێ[٢]، جا بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە دەڵێین: ئەو شتەی لە کاتی پیادەکردنی ڕستەی ژمارە (١) ڕوودەدات ئەوەیە کە لێرەدا کۆمەڵە یەکەیەکی زمانەوانیمان لەژێر دەستدایە، کە تیایاندا هەن ڕێزمانیین، وەکو (ال) لە وشەی (المثابرون ـ کۆششکاران) و، شێوازی (کار)ی لە (فاز – سەرکەوت)، هەروەها تیایاندا هەن فەرهەنگین وەکو (ث ب ر )، کە مانای فەرهەنگی وشەی (المثابرون) پێکدەهێنن و (ف و ز ) کە مانا و چەمکی فەرهەنگی وشەی (فاز) دروست دەکەن، جا لەبەر ئەوەی کە ئێمە دەتوانین پیادەی کۆمەلە ڕستەیەك بکەین بە زمانی عەرەبی، ئەویش لەبەر زانینی یاسا و ڕێزمانی، ئەوا مانای ئەوەیە کە ئێمە ئیتر کۆمەڵە یاسایەکی فۆنۆلۆجی و وشەساز و ڕێزمانیمان پراکتیزە کردووە سەبارەت بە بەرهەمهێنانی ڕستە.

---

(1) Lyons , 1981: 231.
(2) Lyons , 1981 : 124- 125.

**١. کۆششکاران سەرکەوتنیان بە دەستهێنا.( فاز المثابرون).**

ئەو یاسا فۆنۆلۆجی و وشەسازییانەی کە لەسەر ئەو ڕستەیە پراکتیزەمان کرد ئەمانەن:

**١.** دانانی ئەم یەکە فەرهەنگییە (ف و ز) لە شێوازی(کار) بۆ واتابەخشینە، سەبارەت بەوەی کە (کار) کە لە کاتێکی پێشوودا ڕوویداوە، لەم حاڵەتەدا پێویستە (و)ەکە لابرێت، چونکە کەوتۆتە نێوان دوو (فەتحە)وە (فَ وَ زَ)، پاشان هەردوو فەتحەکە بەبێ برگە لە دوای یەکتردا دێن و (الف)ەکە پێکدەهێنن.

**٢.** دانانی یەکەی فەرهەنگی (ث ب ر) لە شێوازی(بکەر) بۆ واتا بەخشینە، لەسەر ئەو کەسەی کە (کار)ەکەی لێ دەرچووە، کە هیچ گۆڕانێکی فۆنۆلۆجی لێ ڕوونەداوە.

**٣.** ناساندنی بکەرەکە (لە جیاتی نەناسراوکردنی) وا پێویست دەکات کە (ال) لە سەرەتای وشەی (المثابرون – کۆششکاران) دابنرێ و لە جێگایەکی دیدا دانەنرێ، هەروەها (ال)ەکە لەگەڵ (م)ەکەی پاش خۆی (ادغام) نەکرێ، چونکە (ال) لێرەدا (شمس)یە و (قمر)ی نییە.

جا لەو یاسا وشەسازی و ڕێزمانیانەی کە بۆ بەرهەمهێنانی ئەم ڕستەیە پراکتیزەکرا، لەم پێکهاتدا نەلکاندنی (جێناوی کۆ) بە کاری (سەرکەوت ـ فاز)ەوە و لە هەمان کاتیشدا پێویست بوونی بەکارهێنانی پاشکۆی (ون) بۆ ئاماژەکردنی بە (کۆ) و (بکەربوون)، هەروەها چەسپاندنی (ن)ەکە، ئەویش لەبەر نەبوونی (مضاف الیه).

پاش پراکتیزەکردنی ئەم کۆمەڵە یاسایە لەسەر ئەم فەرهەنگە سنووردارەی یەکەکان (کە لە کۆمەڵە یەکەی فەرهەنگی ( ف و ز ) و شێوازی (کار) و (ال) و

یەکەی فەرهەنگی (ث ب ر) و شێوازی (بکەر) و پاشکۆی (ون) پێکهاتوون). بەم شێوەیە کۆمەڵە پێکهاتەیەك دروست دەبن بۆ نموونە (فاز) (مثابر) و (المثابر) و (المثابرون) و (فاز المثابرون)، جا بۆ زانینی ڕاست و دروستی هەر پێکهاتەیەك لەم پێکهاتانەی کە باسمان کردوون، بۆ ئەمەش کە حوکمی کۆتاییان بە سەردا بدەین کە تا چ ڕادەیەك ڕاست و دروستن پێویستە بگەڕێینەوە بۆ کۆمەلە یاساکانی فۆنۆلۆجی و یاساکانی وشەسازی و ڕێزمانی کە پێشووتر باسمان کرد، کە ئەمانەش کۆمەڵە یاسایەکی سەر بە ڕێزمانی عەرەبین، چونکە ئێمە لێرەدا باس لە ڕستەیەك لە ڕستەکانی زمانی عەرەبی دەکەین.

هەروەها ڕێزمانی بەرهەمهێن دەستنیشانکردنی وەسفی بونیادگەری گونجاویش بۆ هەر یەکێك لەم پێکهاتانە دەگرێتەوە، هەموو جیاوازییەکەیش لە بونیادی پێکهاتەیەك کە لێی بکۆڵرێتەوە پێویستە بە شێوەی جیاوازییەك لە وەسفی بونیادگەری پەیوەست بە خودی ئەو بونیادەوە دەربکەوێت.

لێرەدا زۆر گرنگە کە جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە بەرهەمهێنەکان هیچ ڕستەیەکی تۆمارکراو لە خودی مادە زمانەوانییەکە وەسف ناکەن، واتە ئەوانەی کە قسەکەران بە کردەیی بەکاریانهێناوە، بەڵکو کۆمەڵەڕستەیەکی گریمانەکراو پیادە دەکەن، ئەویش بە پیادەکردنی پرۆگرامی بەرهەمهێن پاشان تەماشای واقیعی ئەو زمانە دەکەن، ئەویش بە گەڕانەوە بۆ (پێشبینی) زمانەوانی و پرسیاری ئەوەش ئاڕاستە دەکەن کە ئایا ئەو ڕستەیەی کە بە بەرنامەی ماتماتیکی بەرهەمهاتووە، ئایا لەگەڵ زمانەکەدا یەکاویەکە یان پیادەکردنەکەی ساغ و دروستە یا نا؟ لێرەوە زاراوەی (دروستی زمانەوانی) سەرهەڵدەدات، بەم شێوەیە زمانی سروشتی وەك

زمانە وێنەییەکان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، کە زمانێکی داهێنراون، ئەمەش مەسەلەیەکە زۆر لە زمانناسەکان پەسەندی ناکەن[1].

هەر لەسەر بنەمای ئەم پرۆگرامە ڕووت ئامێزەی (تەجریدی) توێژینەوەی زمان کۆمەڵەزاراوەیەك هاتنە ئاراوە و بەکارهێنراون، وەکو قسەکەری نموونەیی کە هیچ بوونێکی لە واقیعی زمانەوانیدا نییە،بەڵکو زمانناسەکان ئەو گریمانەیە دەخەنەڕوو ئەویش بە پشت بەستن بە گومانەکەی و بە بەسبوونە زمانەوانییەکەی، واتە ناسینی یاساکانی زمان و فەرهەنگەکەی.

لە سەرەتادا ناوی لێنرا ڕێزمانی گوێزانەوەی بەرهەمهێن، یاساکانیگوێزانەوە (T – rules) ئەویش بۆ دەست نیشانکردنی ڕستە پەسندەکان لە ڕووی ڕێزمانەوە، جا ئیتر لە هەر زمانێکدا بێ. لە پەرتووکەکەی چۆمسکی کە ناوی (ڕۆنانە سینتاکسسەکان) ڕێزمان دوو شێوەی وەرگرتووە: گوێزانەوەی زۆرەملێ(بەخورتی) وەکو لکاندن، کە بنەمای بەرهەمهێنانی ڕستەی ڕاست و دروستن، و گوێزانەوەی هەڵبژاردەن(ئاسای)، ئەویش وەك نموونەیەك بۆ گۆڕینی کۆمەڵێ ڕستەی (ئەرێ) بۆ ڕستەی (نەرێ) یان (پرسیاری).

پاش چوار دەیە پێشڤەبرنی ڕۆڵی گوێزانەوەکان دەستی پێکرد، ئەویش بە تێخزاندنی بیرۆکەی بونیادە قووڵەکان، ئەمەش وای کرد کە وردە وردە زاراوەی ڕێزمانی بەرهەمهێن لە جیاتی زاراوەی ڕێزمانی گوێزانەوە بەکاربهێنرێت و بە شێوەیەك کە ئەم زاراوەی دووەمە ناوی بزر بوو، ئەوە بوو تیۆری (چۆمسکی) وای لێهات کە بە زمانەوانییە بەرهەمهێنەکان ناسرا[2].

---

(1) Lyons , 1981 : 125 – 126.
(2) See Robins , 1997 : 261.

## گریمانەی بونیادی قووڵ

ڕێزماننناسە بەرهەمهێنەکان لەسەر گریمانەکردنی بونیادگەلی قووڵ deep structuresڕاهاتوون سەبارەت بە پێکهاتە زمانەوانییەکان، کە لۆجیکی زمان چێوەداریان بکات، ئەو زمانەی کە ئەو گریمانەیە دەخەنەڕوو کە قسەکەرانی زمانەکە لە باوکانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، لە هەر زمانێکدا دەکرێ گریمانەی بونیادێك بکەین کە گوزارشت لە ڕوودانی کردارێك بکات، کە لە (بکەر)ێکەوە کەوتبێتە سەر (بەرکار)ێك؛ لەوانەش لە ڕووی لۆجیکییەوە گوزارشت لەم بیرۆکە لۆجیکییە بکات، ئەویش بە چەند بەکارهێنانێکی زمانەوانی جۆراوجۆر، دەکرێ قسەکەرەکان ئەم بیرۆکە لۆجیکییە لە وێنەی (بکەر – کار – بەرکار) یان (بکەر – بەرکار – کار) یان (کار – بکەر – بەرکار) یان (کار – بەرکار – بکەر) یان (بەرکار – کار – بکەر) یان (بەرکار – بکەر – کار) بەرجەستە بکەن، بەڵام ئەم ئەگەرانە لە ڕووی لۆجیکییەوە هەمووی لە واقیعی زمانەکاندا بەدی ناکرێن، بەڵکو هەر زمانێك چەند کۆت و بەندێك دەکاتە سەر ڕوودانی هەندێك یان ژمارەیەکی زۆر لە ئەگەرەکان. لەبەر ئەوە ڕێزماننناسە بەرهەمهێنەکان لەو دەستپێکەوە بیردەکەنەوە کە دروستکردنی پێکهاتە زمانەوانییەکان ڕەهایە، گەر یاساکانی زمان کۆت و بەندێك نەخەنە سەریان. جا گەر گوزارشت بکەین لەم بیرۆکە لۆجیکییەی پێشوو بە زمانی عەرەبی ئەوە دەتوانین بڵێین کە:

١. خالید ضرب سعیداً................ دەشێ

٢. *خالد سعیداً ضرب[1] .............. ناشێ

٣. ضرب خالد سعیداً................ دەشێ

---

[1] ئەم ئەستێرەیە واتای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ڕستەیە نارێزمانییە.

٤. ضرب سعيداً خالد.............. دەشێ

٥. سعيداً ضرب خالد.............. دەشێ

٦. سعيداً خالد ضرب.............. دەشێ

١. خالید لێیدا لە سەعید.

٢.خالید لە سەعیدیدا.

٣. لێیدا خالید لە سەعید.

٤. لێیدا لە سەعید خالید.

٥. سەعید لێیدا خالید.

٦. سەعید خالید لێیدا.

لەم ڕستانەی پێشوو بۆمان دەردەکەوێت، کە دەستنیشانکردنی (خالید) بە (بکەر)ی لۆجیکی و دەستنیشانکردنی (سەعید)یش بە (بەرکار) زۆری ئەگەرەکانی قۆستۆتەوە. جا گەر ناوەکە بگۆڕین و بیکەینە (عیسا) بۆ ئەوەی ببێتە (بکەرە) لۆجیکییەکە و (موسا)ش ببێتە (بەرکار)، ئەوا ئەو کاتە ئەگەرەکان کەمتر دەبنەوە.

١.عيسى ضرب موسى.................. دەبێ

٢. *عيسى موسى ضرب ................ نابێ

٣. ضرب عيسى موسى..................دەبێ

٤. *ضرب موسى عيسى................ نابێ

٥. *موسى ضرب عيسى................ نابێ

٦. *موسى عيسى ضرب................ نابێ

زۆر گرنگە لێرەدا دەرك بە پرۆسەی بەرهەمهێنان بکەین و لە ئەگەرەکان بکۆڵینەوە نەك تەنها ئەو حاڵەتە بەرجەستە بکەین کە قسەکەرەکە پێی

هەڵدەستێت، چونکە ئەوە پرۆسەیەکی گریمانەیی زۆر وردە زماننناس لە کاتی ئەنجامدانی ڕێزمانی بەرهەمهێن پێی هەڵدەستن.

## جیاوازی نێوان بونیادی قووڵ و بونیادی ڕووکەش

زۆر لەو ڕستانەی کە تێیان ڕادەمێنین جیاواز دێنە پێش چاومان، بەڵام ئەگەر بڕوانینە بونیادە قووڵەکانیان دەبینین کە یەك شتە. وێنەی نموونەیی لە هەموو زمانەکان ئەوەیە کە بونیادە قووڵەکانیان لەگەڵ بونیادە ڕووکەشەکانیان یەکاویەك بن، بەڵام ئەم شتە لە واقیعی زمانەوانیدا پراکتیزە نابێت، لەم نموونانە بڕوانە:

١. بەرگی ئاورێشم پێ باشترە.

٢. پەرتووکەکەی مامۆستاکەم پێ باشترە.

٣. نووستنی شەوم پێ باشترە.

٤. ماڵەکە دزرا.

٥. مانەکەم کڕی.

٦. ماڵەکە تیایدا خەوتم.

٧. ماڵەکە کەلوپەلەکەیم فرۆشت.

٨. زەید ئەنجامیدا.

٩. زەید مرد.

جا لە کاتی تێڕامان و لێکۆڵینەوە لە نموونەکانی ژمارە (١) و (٢) و (٣) تێبینی ئەوە دەکەین کە هەموو لە بونیادە ڕێزمانییە دەرەکییەکاندا هاوبەشن ئەویش لەبەر ئەوەی هەموویان لە (کار) و (بکەر) و (بەرکار) و (دیاخەر) پێکهاتوون، بەڵام کاتێك کە بەراوردی نێوان پەیوەندییەکانی ( دیارخراو) و (دیارخەر) دەکەین، ئەوا دەبینین کە ماناکە جیایە، لە نموونەی یەکەمدا دەبینین دیارخراو بە مانای (لە) دێت، واتە

مەبەست ئەوە بەرگەیە کە لە ئاوریشم دروستکراوە. لە نموونەی دووەمیشدا دەبینین دیارخراو بە مانای (ل) دێت، بەم شێوەیە مەبەستەکە وای لێ دێت: (ئەو پەرتووکەی کە هی مامۆستاکەیە). لە نموونەی سێیەمیشدا وا شرۆڤە دەکرێ کە مانای (لە) دەگەیەنێت، بەم شێوەیە مەبەستەکەی دەبێتە ئەو خەوتنەی کە لە شەودایە.

هەرچی لە کۆمەڵەی دووەمیشدا هەیە کە ڕستەکانی (٤) تا (٧) دەگرێتەوە، ئەوا وشەی (ماڵەکە) بە (نیهاد) شیدەکرێتەوە، بەڵام لە واقیعدا لە بونیادی قووڵەوە گۆڕدراوە و لە کاتی گێڕانەوەی بۆ شوێنگەکانی خۆی دەردەکەون:

١. ماڵەکە دزرا.

٢. ماڵەکەم کڕی.

٣. لە ماڵەوە نووستم.

٤. کەلوپەلی ماڵەکەم فرۆشت.

بەڵام هەردوو نموونەی (٨) و (٩) چۆنیەتی ئەوە دەردەخەن کە ڕێککەوتنی شێوەی دەرەکی کە لە وشەی (زید) وەکو بکەرێك بەرجەستە دەبێت، مانای ئەوە نییە کە بونیادە قووڵەکەی یەکێکە، چونکە مانای یەکەمیان ئەنجامدانی زەیدە بۆ ڕووداوی هەستان، کەچی دووەمیان مانای مردنی زەیدە، هەروەکو بونیادە ڕووکەشەکان لەگەڵ جیاوازی بونیادە قووڵەکان ڕێك دەبن، لە هەمان کاتیشدا لەوانەیە لەگەڵ بونیادە قووڵەکان ڕێك بن، بونیادە ڕووکەشەکان جیاواز دەبن، هەروەك لەم دوو نموونەیەی خوارەوەدا:

١. لست بناجح.

٢. لست ناجحا[1]

---

[1] بۆ ئەم بابەتە بڕوانە لێکۆڵینەوەکەی پێشوو : یونس علی، ١٩٩٣ : ص ٢٨٠ — ٢٨٣.

## بونیادی پێکهێنەر

وەکو بەراییەك بۆ شیکردنەوەی بەرهەمهێنی ڕێزمان و جۆرەکانی یاسا بەکارهێنراوەکانی، شرۆڤەیەکی کورتی بیرۆکەی بونیادی پێکهێنەر دەکەین، کە لەو ڕەچەڵەکانەی پەرتخوازەکاندا باوە، کە لە پرۆگرامی پۆست زمانەوانییەکانی بلۆمفیلدیدا تەشەنەی سەند. هەرچەندە کە بیرۆکەی بونیادی پێکهێنەر بیرۆکەیەکی پەرتخوازەکانە، کەچی جیاوازی سەرەکی لە نێوان پەرتخوازەکان و بەرهەمهێنەکان ئەوەیە کە پەرتخوازەکان مامەڵە لەگەڵ ڕێزمانی (المسارد)دا دەکەن، کە گرنگی بە دەست نیشانکردنی یەکە زمانەوانییەکان و پۆلێنکردنیان دەدا، بەلام چۆمسکی گرنگی بە ڕێزمانی یاساکان دەدا کە ئەو کۆمەڵە یاسایانە لە ڕووی پرۆگرامییەوە ڕێك دەخات، ئەویش بۆ ئەوەی کە (لە ڕووی نمونەییەوە نەك لە ڕووی واقیعییەوە) کۆمەڵە ڕستەیەکی پەسند لە زمانەکاندا بەرهەم بهێنێت[1].

پێویستە لێرەدا باس لەوە بکەین کە ڕێزمان لە ماوەی پۆست زمانەوانییە بلۆمفیلدییەکان دابەشکرا بۆ وشەسازی، کە گرنگی بە بونیادی ناوخۆی پێکهاتەی وشە دەدات، و ڕستەسازی کە باس لە دابەشکردنی بونیادەکانی وشە دەکات، بەلام پاشان ئەم پۆلێنکردنەیان پەراوێز خست و لەسەر ئەم بنەمایەش پێناسەی ڕێزمان فراوانتر بوو و وای لێهات کە وشەی ڕێزمان، وشەسازی و ڕستەسازی بەیەکەوە دەگرێتەوە، بەم شێوەیە وای لێهات کە ڕێزمان بووە ئەو زانستە کە باس لە دابەشکردنی وشە گۆڕدراوەکان دەکات، ئیتر لەو ساتەوە وا نەدەڕوانرایە وشەکان کە چەند یەکەیەکی واتایین، بەڵکو بەو شێوەیەی کە ئەرکی کۆمەڵەوتەیەکی بچووك ئەدا دەکەن، هەروەها بەو حیسابەی لە هەندێك زماندا کە بوارێکی بۆ کۆمەڵەنیشانەیەکی فۆنۆلۆجی سەرووی برگەییەوە، ئەمەش ئەم چەمکەیە کە یاسا بەرهەمهێنەکانی

---

[1] See Robins , 1997 : 264.

چۆمسکی کردوویە بنەمایەکی سەرەکی، بەو واتایەی کە بەشێکە لە کەلتوری پۆست زمانەوانییە بلۆمفیلدییەکان[1].

وشەی unfriend liness (نەبوونی برادەرایەتی) بە پێی شیکردنەوەی بونیادی پێکهێنەر لە چوار مۆرفیم پێکدێت، کە ئەمانەن: un –friend – ly – ness، دەشتوانین بونیادی هەرەمی (لوتکەیی) ئەم وشەیە hierarchical structure لە دوو شێوەدا بەرجەستە بکەین: bracketing چەماندنەوە، واتە جیاکردنەوەی نێوان بەشەکانی، ئەویش بە کەوانەی دانراو (هەروەك لە وێنەی (١)دا دیارە)، و درەختکردن واتە دانانی بە شێوەی درەختێك، هەروەکو لە وێنەی (٢)[2]دا دیارە:




لەو لایەنانەی کە پەرتخوازەکان و بەرهەمهێنەکان گرنگی پێ دەدەن، پۆلکردنی ئەو توخمە زمانەوانییانەیە کە لە وێنەکانی پێشوودا لق و پۆپدار بوون، لەسەر ئەم بنەمایەش کۆمەڵە یاسایەك ڕێکدەخەن، وشەی (unfriend liness) واپۆلێن دەکرێت: کە تەنها ناوێکی ڕووتە بە نیشانەیەکی دیاریکراو ئاماژەی بۆ دەکرێت، بۆ نموونە با بڵێین کە ئەو نیشانەیە (س م )ە، زۆریش لەم ناوانە لە زمانی

---

[1] Lyons , 1981: 118.
[2] Lyons , 1981: 119.

ئینگلیزیدا بە بە لکاندنی پاشکۆی (ness) بۆ سەر ئاوەڵناو پیادەدەکرێت.بە هەمان شێوەش لکاندنی (un) بە شێوازی (ئاوەڵناو) پرۆسەیەکی سەر بە وشەسازی بەرهەمهێنە لە زمانی ئینگلیزیدا، کەچی لکاندنی un بە (ناو)ەوەوە پرۆسەیەکی بەرهەمدار نییە. سەرجەم ئەم یاسایانەش بە شێوازی کۆمەڵێك نیشانە پیادە دەکرێن، بۆ نموونە وەك نیشانەی (مق) بۆ کۆمەڵە بونیادێك بەکاربهێنرێت (نموونە ـ unfriend liness) کە لە لکاندنی ( ly) بەو (ئاوەڵناو)انەی کە لە (ناو)ی (نموونە ـ unfriend)ەوە پیادە کراون، ئەوانەی کە دەتوانین بە (سص) ئاماژەی بۆ بکەن، دەتوانین بەم یاسایەی کە لە ژمارە (١)دا دیارە گوزارشت لەو وتانەی پێشوومان بکەین:

١. سص + ly..... مق

واتە لکاندنی ly بە (ئاوەڵناوەکان)ی پیادەکراو لە (ناو)ەوە جۆری (unfriendly) لێ بەرهەم دێت. ئەم یاسایەش وا دەخوازێ کە هەر وشەیەك لە جۆری (مق) دەتوانرێت ئاڵوگۆریان پێ بکرێ، ئەویش لەو دەوروبەرەی کە کۆمەڵەیاسایەکی دی گوزارشتیان لێ دەکەن، وەکو:

٢. مق + ness ..... س م

واتە لکاندنی ness بە شێوازی جۆری (unfriendly) ناوێکی (ڕووت)ی وەکو (unfriend liness) لێی دروست دەبێت.

٣. un + مق ....... مق

واتە لکاندنی un بە شێوازی جۆری unfriendly شێوازێکی دی وەکو جۆری unfriendly لێ دروست دەبێت، کە ئەمەیە un unfriendly[(١)].

---

[(1)] Lyons , 1981: 119 – 120.

هەروەك كە بیرۆكەی پێكهێنەر لەسەر ئاستی وشەسازی جێبەجێ دەبێ، هەر بەو شێوەیەش لەسەر ئاستی ڕێزمانی پراكتیزە دەبێت، مەبەستیشمان لێرەدا ئاستی پەیوەندی نێوان وشەكانە، لە پێكهاتەی ئینگلیزی ( on the wooden table)دا بە پێكهاتەی (پریپۆزیشن و بەركاری ناڕاستەوخۆ) prepositional phrase ناوزەد دەكرێت، دەبینی كە لە پیتی (پریپۆزیشن– on) و پێكهاتەی (ناوی) noun phrase (the wooden table) پێكدێت، ئەم گوزارشتەی دوایش لە (ئامرازی ناسراوی – the) و پێكهاتەی (wooden table) پێكدێت، كە لە (ئاوەڵناو – wooden) و (ناو – table) پێكهاتووە:

وێنەی ژمارە (٣)




هەنگاوی دووەم گۆڕینی كەوانەكردنەكە و چەماندنەوەكەی پێشوو و لق و پۆپداركردنیەتی بۆ كۆمەڵە نیشانەیەكی كورت و پوخت، ئەویش بە پۆلكردن یان بە (نیشانەكردن – table)، لێرەشدا هێمای (ن) بۆ پێكهاتەی (ناو) هەڵدەبژێرین و (پ) بۆ (پریپۆزیشن) و (پ ب) بۆ پێكهاتەی (پریپۆزیشن و بەركاری ناڕاستەوخۆ) و (ئا) بۆ (ئاوەڵناو) و (ئا نا) بۆ (ئامرازی ناسراوی)[1] دادەنێین:

---

[1] Lyons , 1981: 121 – 122.

وێنەی ژمارە (٥)




## جۆرەکانی یاسا لە ڕێزمانی بەرهەمهێندا

ئەو یاسایانەی کە چۆمسکییەکان پێشکەشیان کرد، سێ جۆر یاسایان خستەڕوو کە ئەمانەن:

١. یاسای قۆناغە سنووردارەکان، کە کۆمەڵە یاسایەکن دەتوانن ژمارەیەکی زۆر لە ڕستە بەرهەمبهێنن، ئەویش لەبەر دووبارەبوونەوەی پراکتیزەکردنی ژمارەیەکی زۆر لە یاساکانی ڕێزمانی زۆر و بێشومار، ئەم یاسایانەش لە جۆری دووەم لاوازترن.

٢. یاساکانی بونیادی فرێزیی: ئەمیش ئەو یاسایانەیە کە بواری بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی زۆری ڕستەکانمان بۆ دەڕەخسێنێت، ئەویش بە پراکتیزەکردنی

ژمارەیەکی زۆر لە یاساکان، جۆرێکی تر لە شێوە ڕوونکارەکان ئەویش لە جیاتی درەختەکان، واتە لە جیاتی ئەم لقدارە شێوەکەی پاشتر بەکاردەهێنێت، لە زمانی عەرەبی و زمانی کوردیدا بە پێچەوانەی زمانی ئینگلیزی لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەخوێندرێتەوە:




ڕستە..............فرێزی ناوی + فرێزی کاری

ئەم یاسایەش بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ئەم ڕستەیە لە فرێزی ناوی و فرێزی کاری پێکدێت.

ئەم یاسا ڕێزمانیانەش چەند یاسایەکی فەرهەنگیشیان لەگەڵدان، کە پۆلکردنە ڕێزمانییەکانی تیا وەردەگێردرێت بۆ کۆمەڵە وشەیەکی ئەوتۆ کە لەسەر ئەو جۆرە ڕێزمانانە پراکتیزە دەبێت:

ناو (پیاو، ژن، شێر، دەرگا، ئازایەتی.......... ).

دەشتوانین لێرەدا کۆمەڵە یاسایەکی سانای فرێز پێکهاتن دابنێین، کە دەتواندرێ بۆ بەرهەمهێنانی ژمارەیەکی زۆر لە ڕستەکان بەکاربهێنرێت.

لە یاساکانی بونیادی فرێز:

ڕستە ....... فرێزی ناوی، فرێزی کاری

فرێزی ناوی .......... نیشانەی ناسراوی، ناو (ئاوەڵناو) ناوی تایبەتی.

فرێزی کاری.......... کار، فرێزی ناوی (فرێزی بەند)(ئاوەڵناو)

فرێزی بەند .......... پر پیۆزیشن، فرێزی ناوی

لە یاسا فەرهەنگیەکان:

ناو .......... (کوڕ، کچ، دووربین، سەگ.....).

ناوی تایبەتی .......... (عەلی، فاتیمە............).

ئامرازی ناسین ....... (ەکە)

ئاوەڵناو .......... (بچووک، نامۆ..............).

کار .............. (بینی، دووی کەوت، یارمەتیدا...)

پرپیۆزیشن ........ (بە، لە.........................)

ئاوەڵکار ....... (دوێنێ، بەم دواییە...............)

ئێمە دەتوانین بەم یاسایانە چەند ڕستەیەك لە (١)ەوە تا (٧) بەرهەم بهێنین، بەڵام ناتوانین ڕستە نادروستەکانی پێ ڕوون بکەینەوە، ئەویش لە بونیادنانی یاساییدا.

١. کچەکە دووی کوڕەکە کەوت.

٢. کوڕەکە یارمەتی سەگەکەی دا.

٣. سەگەکە کچەکەی ئێمەی بینی.

٤. فاتیمە بەم دواییە یارمەتی عەلی دا.

٥. دوێنی عەلی سەگێکی بینی.

٦. سەگێکی بچووك دووی فاتمە کەوت.

٧. کوڕە بچووکەکە بە دووربینێکی عاجباتی بەم دواییە عەلی بینی.

٨. *کوڕەکەی فاتیمە بینی.

٩. *کچێك یارمەتی بدە.

١٠. *منداڵێکی بچووك بە دووربین.

یاساکانی بونیادی فرێز هەر لەم بونیادە سادانەدا نییە، بەڵکو جاری وا هەیە ڕستەی ئاڵۆز ڕۆڵی تیا دەبینێت، ئەویش بە پرۆسەیەك کە بە (دووبارەکردنەوە recursion) ناسراوە، لێرەدا هەندێك لەو توخمە زمانەوانییانە بۆ درێژکردنەوە و ئاڵۆزکردنی ڕستەکە دووبارەدەبنەوە، بۆ نموونە زیادکردنی (کار)ی (گومان) لەسەر ڕستەی (خالید یارمەتی سەعیدی دا)، واتە بەم شێوەیە (ئەحمەد واگومانی برد کە خالید یارمەتی سەعیدی دا)، دەشتوانین زیاتر درێژی بکەینەوە و بڵێین: (یوسف وتی : ئەحمەد وا گومانی برد، کە خالید یارمەتی سەعیدی داوە)، ئیتر بەم شێوەیە[١].

٣. ڕێزمانی گوێزانەوە: هەر لەگەڵ پێشڤەچوونی ڕێزمانی بەرهەمهێن، زمانەوانەکان هەستیان بە پێویست بوونی چارەسەری ئەو توخمە زمانەوانییانە کرد کە لە شوێنگەکانی خۆیان گواسترابێتنەوە، بۆیە ژمارەیەك لە یاساکانی گوێزانەوە بۆ ڕوونکردنەوەی گۆڕانکارییەکە داهێنا، هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گواستنەوەیەی کە لەو بونیادانەدا ڕوودەدات، کە لە یاساکانی بونیادی فرێزدا هەیە، بۆ دەرخستنی بکەردیار و ڕستەکانی بکەرنادیار و ڕستەکانی هەواڵگەیاندن و ڕستەی پرسیارکردن.

ئەو شتانەی کە ڕێزماننانسەکان پێی هەڵدەستن ئەوەیە کە لە چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە پەنا دەبەنە بەر گواستنەوەی لقێکی ئەم درەختەیە، ئەویش لە شێوەی لق و پۆپدارا، پاشان لکاندنی بە بەشێکی تری جیاوە، بڕوانە ئەم دوو پۆپ

---

(1) Yule , 1996: 106 – 107.

٩. *کچێك یارمەتی بدە.

١٠. *منداڵێکی بچووك بە دووربین.

یاساکانی بونیادی فرێز هەر لەم بونیادە سادانەدا نییە، بەڵکو جاری وا هەیە ڕستەی ئاڵۆز ڕۆڵی تیا دەبینێت، ئەویش بە پرۆسەیەك کە بە (دووبارەکردنەوە recursion) ناسراوە، لێرەدا هەندێك لەو توخمە زمانەوانییانە بۆ درێژکردنەوە و ئاڵۆزکردنی ڕستەکە دووبارەدەبنەوە، بۆ نموونە زیادکردنی (کار)ی (گومان) لەسەر ڕستەی (خالید یارمەتی سەعیدی دا)، واتە بەم شێوەیە (ئەحمەد واگومانی برد کە خالید یارمەتی سەعیدی دا)، دەشتوانین زیاتر درێژی بکەینەوە و بڵێین: (یوسف وتی : ئەحمەد وا گومانی برد، کە خالید یارمەتی سەعیدی داوە)، ئیتر بەم شێوەیە[1].

٢. ڕێزمانی گوێزانەوە: هەر لەگەڵ پێشڤەچوونی ڕێزمانی بەرهەمهێن، زمانەوانەکان هەستیان بە پێویست بوونی چارەسەری ئەو توخمە زمانەوانییانە کرد کە لە شوێنگەکانی خۆیان گواسترابێتنەوە، بۆیە ژمارەیەك لە یاساکانی گوێزانەوە بۆ ڕوونکردنەوەی گۆڕانکارییەکە داهێنا، هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گواستنەوەیەی کە لەو بونیادانەدا ڕوودەدات، کە لە یاساکانی بونیادی فرێزدا هەیە، بۆ دەرخستنی بکەردیار و ڕستەکانی بکەرنادیار و ڕستەکانی هەواڵگەیاندن و ڕستەی پرسیارکردن.

ئەو شتانەی کە ڕێزماننناسەکان پێی هەڵدەستن ئەوەیە کە لە چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتانە پەنا دەبەنە بەر گواستنەوەی لقێکی ئەم درەختەیە، ئەویش لە شێوەی لق و پۆپدارا، پاشان لکاندنی بە بەشێکی تری جیاوە، بڕوانە ئەم دوو پۆپ

[1] Yule , 1996: 106 – 107.

و لقدارەی کە بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پێشکەوتنی ئاوەڵکاری (دوێنێ) بە سەر شوێنەکەی پێشوویدا، کە نیگاری کێشراوە لەم دوو ڕستەیەی داهاتوودا[1]:

١. عەلی یارمەتی فاتیمەیدا دوێنێ.

٢. دوێنێ عەلی یارمەتی فاتیمەیدا.







(1) See Yule , 1996: 106 – 107.

جگە لەو سێ جۆرەی کە باسمان کرد، ڕێزماننناسە بەرهەمهێنەکان کۆمەڵێ تیۆری تریان لە هەشتاکان پێشکەش کرد، لەوانە یاسا ئەرکییە فەرهەنگییەکان و یاساکانی فریز پێکهاتنی گشتێنراو بوو، ئەم دوو تیۆرەش خۆیان لە ژێر کۆنترۆڵی یاساکانی گوێزانەوە ڕزگارکردبوو، تیۆری یەکەم پشتی بە تایبەتمەندییە فەرهەنگییەکان و دووەمیشیان پشتی بە تایبەتمەندییە لۆجیکییەکان بەستبوو، ئەویش بۆ شرۆڤەکردنی پەیوەندی نێوان ڕستە جۆراوجۆرەکان، تیۆری یاساکانی فریز پێکهاتنی گشتێنراویش وازی لە بۆچوونەکەی چۆمسکی هێنا سەبارەت بەوەی کە ڕێزمان پەیوەندی بە واتاوە نییە، بەڵکو لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە پەیوەندییەکانی نێوان بونیادی ڕستەکان و واتاکانیان بدۆزێتەوە، لە کاتێکدا کە تیۆری یاسا ئەرکییە فەرهەنگییەکان بیرۆکەی ڕاستەقینەی دەروونی گرتەخۆ، کە چۆمسکی بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەمیش ئەو بیرۆکەیە کە پێی وایە تیۆری ڕێزمانی لە حاڵەتێکدا ڕاست دەبێ گەر سیستەمی ئەو زمانە وەسف بکات کە لە مێشکی قسەکەردایە (نەك ئەو شتەی کە لە ماددە زمانەوانییەکە دەستەبەر بووە)[1].

[1] See Mcleish , 1993 : 739 – 740.

# بلـــۆمفیڵـــد

نـاوی تـەواوی (لیۆنـارد بلـۆم فیڵـد)ە، سـاڵی ١٨٨٧ لــە شـیکاگۆ لـەدایکبووە، خوێندنی لە زانکۆی (هێرتبارت) تـەواوکردووە، دوای تـەواوکردنی خوێنـدن دەچێتە وڵاتـی ئـەڵمانیا، بەهۆیـەوە لـە ئـەڵمانیا شـارەزایەکی تـەواو لـەبارەی زمانـەوانی بەراوردکاری پەیدا دەکات، دواتـر لەساڵی ١٩٣٣ کتێبێکـی بـە نــاوی ( زمـان) بڵاودەکاتەوە، ئەم کتێبەی بلۆمفیلّد زیاتر لە ڕوانگەیـەکی ڕەوشـتکارانەیە سـەبارەت بـە زمـان، بـە واتایـەکی تـر لـەم کتێبەیـدا بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەری قوتابخانـەی ڕەوشـتکاری لـەبواری دەروونناسـیدا، هـەروەها بـلۆمفـێڵد ئامـاژە بـەوەش دەکـات کـە سـودێکی زۆری لـە بۆچـوونەکانی سۆسـێر بینیـوە. بـلۆمفیڵد لـەماوەی ژیانیـدا مامۆسـتای زانکـۆ بـووە و لـە زانکـۆی ( شـیکاگۆ، بێـڵ)دەرسی وتۆتەوە، لە سـاڵی ١٨٤٩ بـەهۆی نەخۆشـییەوە کـۆچـی دوایـی دەکات.

## کارەکانی بلـــۆمفیڵـــد لە بـــواری زمـانەوانـــیدا

### ١ـ ڕەوشتکاری

هـەر کاتێك نـاوی (بلۆمفیڵـد)مان گـویّ لێدەبێت، یەکسـەر بیرمـان بـۆ تیـۆری ڕەوشتکاری دەچێـت، (تیـۆری ڕەوشـتکاری یەکێکـە لـە تیـۆرە گرنگـەکانی بـواری واتاسـازی)، بلۆمفیڵــد لــەژێر کاریگــەری قوتابخانــەی ڕەوشــتکاری لــەبواری دەروونناسـیدا بووە، بەو واتایەی ڕەوشتکاری لەڕێگـەی دەرونناسـییەوە هێناوەتـە

ناو بواری زمان، ئەم تیۆرەی بلۆمفیلدیش (تیۆری ڕەوشتکاری) بە تەواوکەر و درێژەپێدەری لە بواری دەروونناسیدا دادەنرێت، بنەمای ئەم تیۆرە لەسەر ( کار و کاردانەوە ) دامەزراوە، بەواتای هیچ کاردانەوەیەك نایەتە ئاراوە ئەگەر پێشتر کارێك نەکرابێ، بەو واتایەی هەموو کارێك لە ڕوانگەی تیۆری ڕەوشتکاریدا پێویستی بە کاردانەوە هەیە، بلۆمفیلد لەم ڕوانگەیەوە نموونەیەکمان بۆ دێنێتەوە **( جاك و جیل دوو برادەری یەکترن، ڕۆژێکیان لەکاتی پیاسەکردندا لەناکاو جیل چاوی بە دار سێوێك دەکەوێت، یەکسەر جیل بە بینینی سێوەکە هەست بە برسی بوون دەکات، بۆیە داوا لە جاك دەکات سێوەکەی بۆ بێنێ، دواتر جاك بەسەر دارەکە دەکەوێت و سێوەکە بۆ جیل دەهێنێت و جیلیش سێوەکە دەخوات)).**

لەم گفتوگۆیەی سەرەوەدا بنەمای کار و کاردانەوە ئەنجامدراوە، بە جۆرێك بینینی سێوەکە و برسێتی جیل بە کارێك دادەنرێت، و لێکردنەوەی سێوەکە و هێنانی بۆ جیل بە کاردانەوە دادەنرێت، لێرەدا کاردانەوەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجامنەدراوە، چونکە جاك هەستاوە بە ئەنجامدانی کارەکە، بۆیە کاردانەوەکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕوویداوە.

کار ← کاردانەوە

کار ← بینینی سێو (برسێتی جیل)

کاردانەوە ← لێکردنەوەی سێوەکە لەلایەن جاکەوە

کاردانەوەی ڕاستەخۆ ← جیل

کاردانەوەی ناڕاستەوخۆ ← جاك

وەك ئاماژەمان بۆی کرد قوتابخانەی ڕەوشتکاری لەبواری زمانناسیدا لەژێر کاریگەریی قوتابخانەی ڕەوشتکاری لەبواری دەروونناسیدا پەرەی پێدراوە، لەم بارەوە ( بافلۆف ) چەند تاقیکردنەوەی لەسەر سەگ ئەنجامداوە لەبواری دەروونناسیدا، ئەم تاقیکردنەوانەی بافلۆف سوودێکی گەورەیان لەبواری زمانناسیدا لێبینراوە،وەکو ئاماژەمان بۆی کرد بافلۆف تاقیکردنەوەی لەسەر سەگ ئەنجامداوە، بەجۆرێك چەند جارێك لەسەر یەك و لە یەك کاتی دیاریکراودا خواردن بۆ سەگەکە دەهێنێت، بەڵام پێش ئەوەی خواردنەکە بدات بە سەگەکە، زەنگێك لێدەدات یاخود لە تاقیکردنەوەی تر گلۆپێك دادەگیرسێنێت، دووبارەکردنەوەی ئەم حاڵەتە بۆ چەند جارێك کاردانەوەیەك لای سەگەکە دروستدەکات، کە ئەویش هەر کاتێك زەنگەکە لێدەدرێت، یەکسەر سەگەکە لیکی دێتەخوارێ یان دەڕژێنێ، بە واتایەکی تر لێدانی زەنگەکە یان داگیرساندنی گلۆپەکە بە (کارێك) هەژماردەکرێت، لەبەرانبەریشدا لیك ڕژاندنی سەگەکە بە کاردانەوەیەك هەژماردەکرێت، ئەگەرچی ئەم ایك ڕژاندنە پەیوەستە بە خواردنەکەوە، بەڵام وەکو ئاگادارکردنەوەیەك لەگەڵ لێدانی زەنگەکە ئەم کارە ئەنجام دەدرێت.

٢ـ بلۆمفیڵد بە دامەزرێنەر و ڕابەری دۆزینەوەی ( مۆرفیم، فۆنیم، ئەلۆمۆرف، ئەلۆفۆن ) دادەنرێت، ئەگەر چی جگە لە بلۆمفیڵدیش زانایانی تریش ڕۆڵیان بینیوە لە دۆزینەوەد و شیکردنەوەی ئەم دانانەی زمان.

مۆرفیم / بچوکترین دانەی واتاداری زمانە یان خاوەن ئەرکی زمانە، کەواتە مۆرفیم یان ئەرکی دەبێت یان واتا، مۆرفیمیش چەند جۆرێکە ( مۆرفیمی ئازاد، مۆرفیمی بەند )، هەروەکو لەم خشتەیەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:







فۆنیم /بچوکترین دانەی زمانە. کە ئەرك و واتا لەخۆی کۆ ناکاتەوە، بەڵکو دەبێتە هۆکارێك بۆ گۆڕینی واتای وشە.

| مـــۆرفـیم | فـــۆنـــیم |
|---|---|
| ١ـ بچوکترین دانەی زمانە. | ١ـ بچوکترین دانەی زمانە. |
| ٢ـ مۆرفیم ئەرك یان واتا دەگەیەنێت. | ٢ـ ئەرك و واتا ناگەیەنێت، بەڵکو تەنیا دەبێـــتە هۆی گۆڕینی واتای وشەکە. |
| ٣ـ مـۆرفیم پیتێکـە یـان زیـاتر، کـە لەمە بچوکتر ناکرێتەوە. | ٣ـ فۆنیم تەنیا پیتێکـــە. |




ئەلۆمۆرف / شـێوە جیاجیاکـانی هـەمان مـۆرفیم دەگرێتـەوە، بـۆ نموونـە مـۆرفیمی (ەکـە)ی ناسـراوی لەهەنـدێ حاڵەتـدا لـەڕووی ڕوخسـارەوە شـێوەکەی ڕەکـو خـۆی دەرناکەوێت، بەڵکو بەچەند شـێوازێکی تـر دەردەکـەوێت، بـە هـەموو ئـەو شـێوازانە دەوترێت (ئەلۆمۆرف )، و بە هەر یەکێك لەم شێوازانەش دەوترێت ( مـــۆرف )

کوڕەکە ( ەکە ) ــــــ مۆرفیمی ناسراوییە

| | | | |
|---|---|---|---|
| کوڕەکـــان ـــ ( ەك ) | | ەك ـــ مۆرف |
| مامۆستاکـان ـــ ( ك ) | ئەلۆمۆرف | ك ـــ مۆرف |
| مامۆستایەکان ـــ ( یەك ) | | یەك ـــ مۆرف |
| مامۆستایەکە ـــ ( یەکە ) | | یەکە ـــ مۆرف |

( ەك، ك، یەك، یەکە ) ئەلۆمۆرفن

ئەلۆفۆن / بەشێوە جیاجیاکانی هەمان فۆنیم دەوترێت، ئەلۆفۆن بەواتای ئەگەر فۆنیمێ لەجیات فۆنیمێکی تر بەکار بێت و واتای وشەکەش نەگۆڕێت، ئەوا پێیدەوترێت ئەلۆفۆن، وەك:

غـەم ـــ خـەم ، سنەوبەر ـــ صنەوبەر

سەمون ـــ صەمون ، ناوەڕۆك ـــ نـاوەڕۆك

سـەد ـــ صـەد ، بـاخ ـــ بـاغ

## سەرچاوەکان

### ١ـ بە زمانی کوردی :-

أـ کتێب:-

١ـ د. ئـەورەحمانی حـاجی مـارف، رێزمـانی کـوردی، بـەرگی یەکـەم (وشەسـازی)، بەشی دووەم (جێناو)، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٧.

٢- د. ئەورەحمانی حاجی مـارف، ڕێزمـانی کـوردی، بـەرگی یەکـەم (وشەسـازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٣ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)(٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی .

٤ـ احمـد حسـن احمـد، ڕێزمـانی کـوردی - بـە کـوردی و عـەرەبی، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٦.

٥- بابیز عمر احمد، تێنس لە دایالێکتی ژووری زمانی کوردیدا ( گوڤەری بادینی)، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، دهۆك، ٢٠٠٢.

٦- د. تالیب حوسێن عەلی، فەرهـەنگی زاراوەکـانی دەنگسـازی، وەزارەتـی پـەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

٧- تۆفیق وەهبی. کورد و زمانی کوردی، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە د. عەزیز گـەردی، زنجیرە کتێبی کیرفنی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٨- تـــەوفیق وەهبـــی، دەســـتووری زمـــانی کـــوردی، جیزمـــی یەکـــەم، (دار الطباعـــة الحدیثة)،بەغدا، ١٩٢٩.

٩- جگرخوێن، أوائو دەستورا زمانی کوردی، چاپخانا صلاح الدین، بەغدا، ١٩٦١.

١٠- جەماڵ نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦.

١١- د. رەفیق شـوانی، چـەند بابـەتێکی زمـان و ڕێزمـانی کـوردی، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١.

١٢- د. زەرێ یوســوپۆڤا، شـێوەی سـلێمانی زمـانی کـوردی، وەرگێڕانــی لــە زمــانی ڕووسییەوە د. کوردستان موکریانی، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان، چاپخانەی وەزاردتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

١٣-سعید سدقی، مختصر صرف و نحوی کـوردی، جـزء ١،چـاپ خانــەی (نجـاح)، بغـداد، ١٩٢٨.

١٤ د. شێرکۆ بابان، نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی کار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنـەوەی ئـاراس، هەولێر، ١٩٩٩.

١٥- صادق بهاء الدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی کرمانجییا ژۆری ژێریا هەڤبەرکری، چـاپا یەکێ، دار الشؤون الثقافیة، بەغدا، ١٩٨٧.

١٦- صالح حسین حسن بشدری، کورتەیەك لە ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی بەغدا، بەغـدا، ١٩٨٥.

١٧- د. عەبدوڵڵا حوسێن ڕەســوول، پوختەیــەکی وردی ڕستەســازی کــوردی، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

١٨- عبدالله شالی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دار الجاحظ)، بەغدا، ١٩٧٦.

١٩-پرۆفیسۆر ك.ك. کوردۆییێف، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، وەرگێڕانی د. کوردستانی موکریانی، ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٢.

٢٠- لیژنەی دەستووری زمانی کوردی، هەندێ لە بابەتە کێشەدارەکان لە ڕێزمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٥.

٢١- لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.

٢٢-محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایێك لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧٤.

٢٣- د. محەمەد مەحوی، ڕستەسازیی کوردیی، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠٠١.

٢٤- د.نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی — بۆ پۆلی یەکەمی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەدین، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٢.

**٢٥ـــ نەسرین فەخری(د)(٢٠٠٢)، ڕستە و چەمکی ڕستە بەگشتی و بەتایبەتمەندییەکانی لە زمانی کوردی دا، بەغدا.**

٢٦ـــ نوری عەلی ئەمین، ئەرك و شوێنی ڕشاناوە کەسی یەکان لە ((ئاخاوتنی کوردی))دا.دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ( مطبعة الزمان )، بەغدا، ١٩٨٦.

٢٧- نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠.

٢٨- نوری علی أمین، قەواعدی زمانی کوردی لە صرف و نەحودا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٦.

٢٩- نوری علی أمین، قەواعدی زمانی کوردی لە صرف و نەحودا، بەرگی دووەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٨.

٣٠- نیعمەت عەلی سایە، ڕێزمانی کوردی زاری کەلهوڕی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٣١- پرۆفیسۆر وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

ب- گۆڤار :-

١- د. ئەوڕەحمان حاجی مارف، کرداری کارا دیارو کرداری کارا بزر لە زمانی کوردیدا، گ. کۆڕی زانیاری عێراق — دەستەی کورد، بەرگی (٢٥ و ٢٦)، بەغدا، ١٩٩٤.

٢- د. زەریێ یوسوپۆڤا، کار، وەرگێڕانی د. کوردستان موکریانی، گ. ڕۆشنبیری نویێ، ژ. (١١٦)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧.

٣- د. کامل بەصیر،بەراوردکاریەك لە نێوانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ. کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد)، بەرگی سیازدەهەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨٥.

٤- لیژنەی ڕێزمان لە کۆڕی زانیاری عێراق — دەستەی کورد، ڕستەسازی لە زمانی کوردی دا، گ. کۆڕی زانیاری عێراق — دەستەی کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، ١٩٨٦.

٥- موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی، کاری (بکەر نادیار) لە زمانی کوردیدا، گ. نووسەری نویّ، ژ.(٢١) بەهاری ٢٠٠٤.

٦- نەریمان خۆشناو، چەمك و پێناسەی کارای نادیار، گ. ئاسۆی پەروەردەیی، ژ . (٤٢)ی نیسانی ٢٠٠٤.

٧- نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، کاری تێپەڕ – لێکۆڵینەوەیەکی بەرانبەرییە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ. کاروان، ژ. (١٩٨)ی ساڵی ٢٠٠٥.

٨- نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، کاری بکەر نادیاری لە زمانی کوردیدا و چەند سەرنجێك، گ. نووسەری نویّ، ژ. (٢٢)ی هاوینی ٢٠٠٤.

٩- د. نەسرین فەخری، پاشگری (اندن) لە زمانی کوردیدا، گ. کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم – بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤.

١٠- دوکتۆر نەسرین فەخری، کەی ؟ کار بە بکەر نادیار تۆمار دەکرێت ؟ چۆن و بۆ ؟!، گ.ڕۆشنبیری نویّ،ژ. (١٣٠) ی ساڵی ١٩٩٣.

١١- وریا عمر أمین، بنج و سیما و یاساکانی گوێزانەوە، گ.ڕۆشنبیری نویّ، ژ.(١٢١)، ئاداری ساڵی ١٩٨٩.

١٢- وریا عمر أمین،تێنەپەر فرمانێکی بکەر نادیارە، گ.ڕۆشنبیری نویّ ژ.(١٠٧)، ئەیلولی ساڵی ١٩٨٥.

١٣- وریا عمر أمین، ڕستەی بکەر نادیار، گ. ڕۆشنبیری نویّ، ژ.(٩٥)، ساڵی ١٩٨٢.

١٤- وریا عمر أمین،لە پەیوەندییەکانی بکەری نادیار، گ. ڕۆشنبیری نویّ، ژ . (١٢٩)، ساڵی ١٩٩٢.

ج-نامەی ئەکادیمی:-

١-ئاواز حەمە صدیق بەگیخانی، ڕیزبوونی کەرستە لەزمانی کوردی دا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦.

٢- أحمد حسن فتح الله، بکەر وەك بەشێکی سەرەکی ی ڕستە لە زمانی کوردی دا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین، ئەیلولی ١٩٩٠.

٣- تارا عەبدوڵلا سەعید، هەندێك لایەنی ڕێزمانی زاری فەیلی — لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی کۆلیژی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٨.

٤- حاتەم ولیا محەمەد، فرێزی ناوی و فرێزی کاری لە کرمانجی ژووروودا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی زمانی زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠.

٥- دیار علی کمال کریم، ڕێزمانی کوردی روانگەیەکی بەرهەمهێنان و گوێزانەوە، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیجی پەروەردەی زانکۆی سەلاحەدین، تشرینی یەکەم ٢٠٠٢ .

٦- طالب حسین علی، هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی کۆلیجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ئەیلولی ١٩٩٨.

٧- عومەر مەحموود کەریم، کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی پەروەردە (ئیبن روشد)ی زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٤.

٨-عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول، ناکردن لە کوردیدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلێجی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین، ئەیلولی ١٩٩١.

٩-عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول ،مۆرفێمە ڕێزمانیەکانی کار ،نامەی دکتۆرا، بەشی کوردیکۆلێجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا ١٩٩٦.

١٠- فەرەیدوون عەبدول محەمەد، نادیاری – لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردە لە نێوان دوو زاری کوردی دا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ئابی ١٩٨٨.

**١١- قەیس کاکل تۆفیق (١٩٩٥)، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین.**

١٢- مصطفی محمد زەنگەنە، کارو ئەرکی لە سینتاکسدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین، ئابی ١٩٨٩.

١٣-مهاباد کامل عبدالله، کار لە کرمانجی ی خواروو و هەورامی دا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین، حوزەیرانی ١٩٩٦.

١٤- یوسف شریف سعید، دۆخەکانی ژێرەوە لای فیلمۆر و هەندێ لایەنی ڕستەسازی کوردی، نامەی ماجستێر،بەشی کوردی کۆلێجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، حوزەیرانی ١٩٩٠.

١٥-یوسف شریف سعید، کاری لێکدراو لە کوردی و فارسی – لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٨.

**١٦- یوسف نوری محەمەدئەمین(٢٠١٠)، هەندێ لایەنی ڕستەی لێکدراو لە زمانی کوردیدا - بەپێی یاساکانی گوێزانەوە، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین .**

٢- بە زمانی عەرەبی :-

أ- كتێب :-

١- القرآن الكريم .

٢- الاستاذ الشيخ احمد الحملاوي، شذا العرف في فن الصرف، طبعة الثانية، مكتبة دار العلمية، لبنان، ٢٠٠٠.

٣- انطوان الدحداح، معجم قواعد اللغة العربية في جداول و لوحات، طبعة التاسعة، مكتبة لبنان ناشرون، بيروت، ١٩٩٧ .

٤- د. أميل بديع يعقوب، قاموس تصريف الافعال والأسماء، طبعة الثانية، لبنان، ١٩٩٨.

٥- د. حاتم صالح الضامن، الصرف، وزارة التعليم العالى و البحث العلمي، جامعة بغداد، ١٩٩١.

٦- راجي الأسمر، مرجع الطلاب في اللغة العربية، الطبعة الأولى،جروس ترس، لبنان، ١٩٩٥.

٧- د. عبده الراجحي، دروس في شروح الألفية، دار النهضة العربية للطباعة والنشر ، بيروت، ١٩٨٠ .

٨- د. فاضل صالح السامرائي، معانى النحو، الجزء الثاني، الطبعة الثانية، دار الفكر للطباعة و النشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٣.

٩- د. فاضل صالح السامرائي، معانى النحو، الجزء الثالث، الطبعة الثانية، دار الفكر للطباعة و النشر و التوزيع، عمان، ٢٠٣.

١٠- كمال ابراهيم، عمدة الصرف، مطبعة النجاح، بغداد، ١٩٥٧.

١١- محمد علي الخولي، معجم علم اللغة النظري – انطليزي – عربي، مكتبة لبنان، بيروت، ١٩٨٢.

١٢-شيخ مصطفى الغلاييني، جامع دروس العربية، الجزء ١،٢،٣، طبعة الاولى، دار الكوخ للطباعة والنشر، ٢٠٠٤.

١٣- آية الله الشيح مصطفى النوراني، قواعد الصرف، طبعة الرابعة، مكتب اهل البيت، ٢٠٠١ .

١٤- د. هاشم طه شلاش و آخرون، المهذب في علم التصريف، وزارة التعليم العالي و البحث العلمي، جامعة بغداد، ١٩٨٩.

ب- انترنيت .

سعيد الأفغاني، الموجز قواعد اللغة العربية .

ڕستەسازی ئاستێکی گرنگی زمانە، و لەگەڵ وشەسازی ئاستی ڕێزمان پێکدێنن، لێکۆڵینەوەش لەم ئاستەی زمان لە زمانی کوردیدا کەمە، یاخود هەمەلایەنانە نین، بەڵکو نووسینەکان هەریەکەیان لایەنێکی دیاریکراوی ڕستەیان گرتۆتەخۆ، کە ئەمەش وای لە ئێمە کرد ئەم بابەتە هەڵبژێرین و بەگوێرەی توانای خۆمان لەسەر ئەم بابەتە بنووسین.

چاپخانەی ڕۆژهەڵات
هەولێر